





هاکان مەنگوچ



# ئازار هەمیشە ڕێت پیشان دەدات

وەرگێڕان: سەروەر عومەر

# ئازار هەمیشە
# ڕێت پیشان دەدات

# ئازار

# هەمیشە

# ڕێت

# پیشان دەدات

## هاکان مەنگوچ

وەرگێڕانی
سەروەر عومەر




ناوی کتێب: **ئازار هەمیشە ڕێت پیشان دەدات**

بابەت: **تەسەوف، دەروونناسی**

نووسینی: **هاکان مەنگوچ**

وەرگێڕانی: **سەروەر عومەر**

دیزاین: **وەرگێڕ**

تیراژ: **١٠٠٠ دانە**

نۆرەی چاپ: **یەکەم/٢٠٢٢**

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان

ژمارەی سپاردنی ( ١٦٢٣ )ی ساڵی ٢٠٢٢ی پێ دراوە








کتێبخانەی گۆڵدن بووک

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

07701598762 - 07501444434

Golden book | ktebfroshe_warzer

Warzer Book | ktebfroshe_warzer




"ئەگەر کەسێک... پاکەرەوە بێت، دەبێت هەر بەو شێوەیە شەقام و ڕێڕەوەکان خاوێن بکاتەوە کە مایکل ئانجیلۆ نیگاری دەکێشا، بیتهۆڤن سەمفۆنیای دروست دەکرد و شکسپیر شیعری دەنووسی. ئەو دەبێت بە شێوەیەک شەقامەکان گسک بدات کە تەواوی بوونەوەرە ئاسمانی و زەوینییەکان تاوێک ڕاوەستن و بڵێن؛ لێرەدا پاکەرەوەیەک کاری دەکرد کە کارەکەی خۆی بە باشی ئەنجام دەدا."

مارتین لۆتەر کینگ

دەربڕینێکی سادەی هەژدە بەیتی سەرەتای کتێبی مەسنەوی کە دەبێتە هۆی گۆڕینی تێڕوانینی تۆ سەبارەت بە ژیان.



# پێشەکی

کاتێک لەگەڵ هاکان مەنگوچ ئاشنا بووم، تایبەتمەندیی زۆری هەبوو کە منی خستە ناو بیرکردنەوەوە؛ ڕەوانیی وتەکانی، ئەدەبیاتێکی سادە و گەرموگوڕ، دەربڕینی خەمە سەرەکی و جیددییەکانی مرۆڤی ئەمڕۆ.

بڕیارم دا کە زیاتر لەبارەی ئەم نووسەرەوە بزانم، کاتێک زیاتر ناسیم، زیاتر شەیدای دونیابینییەکەی بووم:

هاکان مەنگوچ، لە شاری بورسای تورکیا هاتۆتە دونیاوە و خوێندکاری زانکۆی ئەلووداغ (Uludag)ی ئەم شارەیە. لە منداڵییەوە حەزی لە مۆسیقا بووە و لە پازدە ساڵیدا سازەکانی نەی و پیانۆ فێربووە. ئەو بۆ خوێندن چووە کۆنسێرڤاتۆری (کۆلێژی مۆسیقا) و دوای دوو ساڵ وازی لە خوێندن لەم بەشەدا هێنا. بەڵام پەیوەستبوونی بە سازی نەیەوە، ئەوی بە ڕێگەی تەسەوف و عیرفان و فەلسەفەی سۆفیگەریی ئاشنا کرد. هەر بەم هۆیەوە خۆی فێری تورکیی عوسمانی کرد و ساڵانێک دواتر لە گەشتێکیدا بۆ تەورێز، زێدی شەمسی تەورێزی، بۆ تێگەیشتنی باشتر لە مەسنەوی مەعنەوی، هەم خۆی فێری زمانی فارسی کرد، هەم چووە خزمەت چەند کەسێک لە گەورەکانی تەسەوف لەم ناوچەیە.

هاکان لە تەمەنی بیستساڵیدا لە زۆرێک لە زانکۆکان، کۆمەڵە سیمینارێکی لەژێر ناوی خودناسی، ئاشنابوون بە هزری ناخودئاگا، متمانە بەخۆبوون بۆ وتاردان بەرانبەر کۆمەڵ و ڕێگاکانی زیادکردنی پاڵنەری دەروونی ئامادە و پێشکەش کردووە. نووسراوەکان، حیکایەتەکان و هێندێک جار بەیادهێنانەوەکانی لە بارەی چەند بەشێکی ژیانی ڕۆژانەوە، لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا پێشوازییەکی میلیۆنی لێ کراوە.

ساڵی ٢٠١٤، حەزی زۆری بۆ دەروونناسی و ئاژەڵان، ئەوی بەرەو ئەفریقای باشوور بەکێشی کرد. لەوێدا ماوەیەک لەگەڵ شێر و پڵینگەکانی بەنگالدا ژیانی بەسەر برد و شێوازی ڕاگرتن و ڕاهێنانی ئەم ئاژەڵانە لە خەڵکی ناوچەکەوە فێر بوو. ساڵی ٢٠١٥، لە کۆڕبەندی **TED** کە بە ئامادەبوونی نوێنەرانی ١٢٥ وڵاتی دونیا ساز دەکرێت، بەشداری کرد و لەبارەی فەلسەفەی عیرفان و سۆفیگەرییەوە وتارێکی پێشکەش کرد. هەروەها کۆمەڵێک خوولی لەژێر چاودێریی وەزارەتی پەروەر و فێرکردنی تورکیا، ژوورەکانی بازرگانی و پیشەسازی و هەروەها دامەزراوەکانی سەرمایەگوزاری بەڕێوە بردووە. مەنگوچ ساڵی ٢٠١٦، لەسەر بانگهێشتی پرۆفیسۆر ئەحمەد چامساری، وتاری کردنەوەی زانکۆی مێرسینی بۆ ساڵی خوێندنی ١٧-٢٠١٦ پێشکەش کرد. ئەو خۆی بە مۆسیقار، نووسەر و لەگەڵ ئەمانەیشدا وتاربێژ دەناسێنێت کە حەز دەکات زانین و زانیارییەکانی لەگەڵ هەمووانـدا بەشداری پێ بکات.

ئەو وەک سۆفییەک، ژەنیاری مۆسیقا، نووسەر و ڕاوێژکار، زانیاری و تێگەیشتنی خۆی لەبارەی فەلسەفەی سۆفیگەریی و بەرهەمی

مرۆڤـە مەزنەکانـی وەک مەولانـا، شەمسـی تەوریـزی، یونـس ئیمـرە... دەخاتـە بـەردەم هـەوادارانی.

هـاکان مەنگـوچ ئـەو فێربوونانـەی لەسـەر بنەمـای فەلەسـەفەی سـۆفیگەری بونیـات نـراون، بـە هـەردوو کتێبـی «مـن وەک نەیـەک وام و دڵـت کـە پـاک بێـت چیرۆکەکـەت کۆتاییەکـی خۆشـی دەبێـت»، تـا ئێسـتا بـە گوێـی سـەدانهەزار کـەس گەیانـدووە و بـەو سـیمینارانەی پێشکەشـیان دەکات، چ لـە نـاوەوەی وڵات و چ لـە دەرەوەی وڵات، لـە دڵـی میلیۆنـان کەسـدا جێگـەی خـۆی کردۆتـەوە. کتێبەکانـی ئـەو بـۆ زمانەکانـی ئینگلیـزی، ئەڵمانـی، فارسـی، بولـگاری، ئەلبانـی و ڕوسـی وەرگێـڕدراون.

ئـەم نووسـەرە گەنجـە، مامۆسـتا و سـەرۆکی ئەکادیمیـای سـۆفی لـە زانکـۆی ئەمریکایـی گیرنەیـە، هونەرمەندێکـی نەیژەنیشـە، ڤیدیۆکانـی ژەنینـی نـەی، لـە تـۆڕە کۆمەڵایەتییەکانـدا تـا هـەنووکـە میلیۆنـان بینەریـان هەبـووە.

## فەلسەفەی ژیان

ئـەو ڕایدەگەیەنێـت کـە فەلسـەفەی ژیـان لەسـەر بنەمـای هیـواداری و بەشـداری پێکردنـی ئەوانـی تـر لـەم هیواداریيەدا بونیاد نـراوە، هەروەهـا پێـی وایـە: «هیـواداری بـە واتـای بیرکردنـەوەی ئەرێنیـی پەتـی نییـە، هـاوکات بـە واتـای نادیدەگرتنـی ئـەو تراژیدیایانەیـش نییـە کـە لـە ژیانـدا ڕووبەڕوویـان دەبینـەوە،

بەڵکوو بە واتای لەبەرچاوگرتنی هەر ئەگەرێکە. واتا لە جیاتی دانیشتن لە کونجی ماڵەوە و گلەیی و گازندە کردن، هەر کارێکت بۆ باشبوون لەدەست دێت، ئەنجامی بدە.»

هاکان مەنگوچ بەم جۆرە ڕای خۆی دەردەبڕێت کە بۆ بەدیهێنانی هیوا لەسەر زەوی، تەنانەت یەک کەسیش بەسە. بۆیە «تۆ» دەتوانی ئەو کەسە بیت. بەم جۆرە «تۆیەکی» تازە سەرلەنوێ لەدایک دەبێت و پاشان تۆیەکی تر و بەم شێوەیە «تۆ» هێندە بڵاو دەبێتەوە تا دەبێت بە «ئێمە».

لەم ڕووەوە هاکان مەنگوچ بەرگری لەم بیرکردنەوەیە دەکات کە دەڵێت: «لە جیاتی قسە وتن بە تاریکی، مۆمێک دابگیرسێنە«. ئەم نووسەرە گەنجە بە گوێگرتن لە وتەی مامۆستاکانی، ئەو مۆمەی بۆ بەخشینی ڕۆشنایی بە ڕێڕەوی ئەوانی تر دایگیرساندووە، کردۆتە ئامانجی خۆی و لەم ڕێیەدا هیواخوازە بە داگیرساندنی مۆمی ناخی ئەوانی تر، ورە و بوێرییان پێ ببەخشێت.

هەر بەو جۆرەی مەولانا وتوویەتی: «کاتێک مۆمێک مۆمێکی تر دادەگیرسێنێت، هیچ لە ڕۆشناییەکەی کەم نابێتەوە، بە پێچەوانەوە دەبێتە هۆکارێک تا تاریکییەکان ڕووناک بکاتەوە.»



## لەبارەی هاکان مەنگوچەوە چی وتراوە؟

«کتێبەکانی هاکان مەنگوچ، وەک ڕەچەتەیەک بۆ نەخۆشەکانم دەنووسم.»

پرۆفیسۆر دوکتۆر زەینەب دەمیرچی

هاکان مەنگوچ کەسایەتییەکی هەیە کە زۆر گونجاوە لەگەڵ ئەو کارەی ئەنجامی دەدات...

ئەو کەسێکی ئارام و خاوەن حەوسەڵەیە و لەبارەی بیرکردنەوەی خۆیەوە گەشبینە. بەڕای من هاکان هەر تەکنیکێک کە دەری دەبڕێت، سەرەتا لە ناخی خۆیدا پیادەی کردووە، بە تەواوەتی خۆی هەرسی کردووە و ئەم بابەتە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو تایبەت و ناوازە بێت.»

پسپۆڕی دەروونناسی کلینیکی، ئیسرا ئەزمەجی

هێندێک جار دەکرێت بەها بەخشین بە مرۆڤێک کارێکی دژوار بێت؛ کاتێک دەمانەوێت ئەم کارە ئەنجام بدەین، حەز دەکەین نەرێنی بین. لە کاتێکدا بەڕای من باشترە کەمێک سەبارەت بە خۆمان ئەرێنی بین تا هەستێکی باشتر لە ئێمەدا بەدی بێت، تا ئەو وزەیەی لە ناخماندایە بدۆزینەوە، بۆ ئەوەی بتوانین تواناکانمان ئاشکرا بکەین و دەریانبخەین،

ئەم بابەتە زۆر گرنگە. ئەگەر بمانەوێت ئەم پرسە وەک ڕێڕەو و ڕێگەیەک ببینین، ئەو کەسەی پێویستە لە تەنیشتمانەوە بێت، هاکان مەنگوچە. تەنانەت ئەو کاتانەیش کە باوەڕ بەخۆبوونتان لەدەست داوە، ئەو دەستتان دەگرێت و یارمەتیتان دەدات یەک لە دوای یەک بەسەر پلیکانەکاندا سەر بکەون. سەرەڕای ئەوەیش جوانترین بەشی ئەم کارە لێرەدایە، کاتێک ئەو هەستە لە ئێوەدا دروست دەکات کە ئەم سەرکەوتنە زیاتر لەو، تایبەتە بە خودی خۆتان! هاوڕێی ئازیزم هاکان، ڕێگاکەت ڕووناک و بێ بەربەست بێت.»

پرۆفیسۆر دوکتۆر مورات ئاکسوی
پێشکەشکاری بەرنامەی «پزیشکی من»

«کاتێک بۆ یەکەم جار هاکان مەنگوچم لە سیمینارێکدا بینی، بەخۆمم وت، هەر بەڕاستی نووری ئیلاهی لە بوونی ئەودایە. بەم نوورە ڕێگەی مرۆڤەکان ڕووناک دەکاتەوە و دەست لە دڵی یەک بە یەکیان دەدات.»

فەرهاد ئاکیف، نووسەر و دەرهێنەر

«هاکان مەنگوچ یەکێک لە پێشەنگانی فەلسەفەی سۆفیگەرییە لە سەدەی بیست و یەکدا.»

سەرهات ئاکپینار،
سەرۆک و دامەزرێنەری زانکۆی ئەمریکایی گیرنە.

ئەم کتێبەی بەردەستتان «ئازار هەمیشە ڕێت پیشان دەدات» هەژدە دێڕی سەرەتای کتێبی مەسنەویمان بە زمانێکی زۆر سادە و بە کۆمەڵێک چیرۆکی کورت بۆ ڕوون دەکاتەوە، تا بتوانین تێگەیشتنێکی باشتر لە نەینامەی مەولانا بەدەست بخەین و فێر ببین چۆن ئەو دێڕانەی چەند سەدەیەک لەمەوبەر وتراون، وەک ڕێگەچارەی کردەیی بۆ ئاڵۆزییەکانی ژیانی خۆمان لەم ڕۆژگارەدا بەکار بهێنین.

خولیای سەرەکیی من لە وەرگێڕانی کتێبەکانی ئەم نووسەرەدا گواستنەوەی تەواو و پڕاوپڕی ئەو هەستەیە کە لە پشت وتەکانی ئەوەوە شاردراونەتەوە. فەلەسەفەی ژیانی هاکان مەنگوچ هیوایە و بڵاوکردنەوەیەتی لە نێو خەڵکدا.

ئەو باوەڕی وایە تەنانەت یەک کەسیش بۆ زیندوو هێشتنەوەی هیوا دەتوانێت بەس بێت و تۆ دەتوانی یەک کەس بیت و پاشان تۆیەکی تر و تۆیەکی تر. هیوادارم لەم بوارەدا سەرکەوتوو بووبم. داوا لە خودا دەکەم خوێندنەوەی ئەم کتێبە تێگەیشتنێکی تازە بۆ ئێوەی خوێنەرانی ئازیز بەدی بهێنێت کە ئەمە ئارەزووی نووسەری کتێبەکە و منیشە.



# مەولانا کێیە؟

مەولانا سالّی ١٢٠٧ی زایینی لە شاری بەلّخ کە ئەمڕۆکە دەکەوێتە سنووری ئەفغانستانەوە، هاتە دونیاوە. دایکی ناوی موئمینە خاتوون بوو و باوکی بەهائودین وەلەد یەکێک لە ناودارترین سۆفییەکانی شاری بەلّخ بوو، بە سولّتانولعولەما واتا سولّتانی زاناکان ناوی دەرکرد بوو.

مەولانا لە تەمەنێکی کەمدا و لە لای باوکی، دەستی بە فێربوونی فەلسەفە و زانستی دین کرد.

سالّی ١٢١٤ بۆ بەغداد و سالّی ١٢١٨ بۆ کارامان کۆچیان کردبوو. لە لایەن سولّتان عەلائودینی سەلجوقییەوە قوتابخانەیەک بۆ باوکی مەولانا لە شاری قونییە دامەزرێنرا.

بەهۆی ئەوەی مەولانا لە وڵاتی ڕۆمیش کە ئەو کات دەکەوتە ڕۆژئاوای ئەناتۆڵیی حکومەتی سەلجوقییانەوە ژیا بوو، نازناوی ڕۆمی بۆ ناوەکەی زیاد کرا بوو. دوای ئەوەی باوکی سالّی ١٢٣١ لە دونیا دەرچوو، دەستی بە وانە وتنەوە لە قوتابخانە کرد.

بەهۆی ئەو ڕێز و خۆشەویستییەی بۆ قوتابی و هاوەڵانی هەیبوو، هەمووان ئەویان بە "مەولانا" واتا سەروەری ئێمە بانگ دەکرد. بەم شێوەیە بە مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی ناوی دەرکرد.

وشەی "مەولانا : سەروەرمان" بۆ مەزن پیشاندانی ئەو بەکار دەهێنرا. نازناوی پادشایش لە لایەن باوکییەوە پێی بەخشرا.

شیعرەکانی مەولانا کە لە هەر چوار گۆشەی دونیا بۆ دەیان زمان وەرگێڕدراون، لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ماوەیەک پڕفرۆشترین دیوانی شیعر بوو.

## ناسینی شەمس

مەولانا بەرلە ناسینی شەمس زانایەک بوو کە هەموو خەڵک ڕێزیان لێ دەنا و ڕاوێژیان پێ دەکرد. ئەو لە بواری دین و فەلسەفەدا خۆی بە ئاستێکی بەرز گەیاندبوو، بەڵام بەردەوان هەستی دەکرد بۆشاییەک لە دەروونیدا هەیە. هەر بەو جۆرەی کە پاشان خۆی لە شیعرێکیدا دەریبڕی، گەوهەری عیشق لە بوونیدا کەم بوو.

خۆر و مانگم هات، بیستن و بینینم هات

ئەو زیوینەم هات، ئەو کانی زێڕەم هات

مەستیی ناو سەرم هات، ڕۆشنایی چاوانم هات

گەر شتێکی ترت دەوێ، شتێکی ترم هات

ئەو ڕێگرەم هات، ئەو تەوبەشێکنەم هات

ئەو یوسفە زیوینە لەناکاو بۆ لام هات

ئەمڕۆ باشتری لە دوێنێ، ئەی هاودەمی دێرینە

من مەستی ئەوە بووم کە هەواڵی ئەوم پێ گەیشت

ئەو کەسەی بەردەوام بە چراوە بەدوایدا دەگەڕام

ئەمڕۆ وەک ئینجانەی گوڵ هاتە سەر ڕێگەکەم

لە قونییە لە قەراغ شەقامێکەوە، خانوویەکی بچووکی ڕەنگ پیرۆزەیی بوونی هەیە کە زۆر لە کابینەیەکی تەلەفۆنکردن دەچێت.

بەوێ دەڵێن "شوێنی یەکگرتنی دوو زەریاکە" مجمع البحرین... ئەوێ شوێنێکە کە مەولانا و شەمس بۆ یەکەمجار یەکتریان بینی. لەو شوێنەدا کە ئەم دوو زەریایە بە یەک دەگەن... کاتێک دووبارە دوو زەریا بە یەک دەگەن، چی ڕوو دەدات؟ دەبن بە ئۆقیانوس، بێ سنوور دەبن.

شەمس یەکسەر بە بینینی مەولانا بۆی دەردەکەوێت ئەو کەسەی بەدوایدا دەگەڕێت مەولانایە، بەڵام دەیویست تاقی بکاتەوە بزانێت ئایا دڵی ئامادەی قەبوڵکردنی ئاگری عیشقی هەیە یان نا.

سەبارەت بە دیداری ئەو دووانە گێڕانەوەی زۆر بوونیان هەیە؛ یەکێک لەم گێڕانەوانە ئەوەیە کە کاتێک چاویان بە یەک دەکەوێت، مەولانا لەگەڵ قوتابییەکانیدا بووە کە لە نێوان ئەو کۆمەڵەدا لە ناکاو شەمس بانگی دەکات.

دەڵێت: "ئەی مامۆستا! پرسیارێکم لە تۆ هەیە."

مەولانا گوێی لە دەنگەکە دەبێت، بەڵام پێی وا نییە لەگەڵ ئەوی بێت. پاشان شەمس دووبارە و ئەم جارەیان بە دەنگی بانگی دەکات.

"ئەی مامۆستا! پرسیارێکم لە تۆ هەیە، وەڵام دەدەیتەوە؟"

مەولانا ئاوڕ دەداتەوە و بە وردی سەیری غەوارەیەک لە جلوبەرگێکی ڕەشدا دەکات و هەست بە شێوازی جیاوازی هەڵسوکەوت، متمانەبەخۆبوون و دڵنیایی ئەو دەکات.

دەڵێت: "فەرموو؛ پرسیارەکەت هەرچییەک هەیە، بیکە."

خەڵک کونجکۆڵ دەبن؛ چونکە ئەو کارەی ئەم غەوارەیە ئەنجامی دەدات، لە چوارچێوەی ئەدەبدا ناگونجێت. لەبەر ئەوەی ئەگەر بڕیارە پرسیارێک لە مەولانا بکرێت دەبێت بۆ یەکێک لە وانەکانی ئەو بڕوات و لەوێ لەگەڵ خودی ئەو قسە بکرێت، نەک لە ناوەڕاستی کۆڵاندا!

شـەمس کـە سـەرسـامبوونی چواردەورەکـەی هیـچ کاری تێنـاکات، پرسـیارەکەی دەکات:

"غایـت و ئامانجـی تـەواوی ئـەو کتێبانـەی خوێندوتـەوە و ئـەو زانسـتەی فێری دەبیـت چییـە؟"

مەولانـا دووبـارە بـە نیگایەکی قووڵ لە غەوارەکە ڕادەمێنێت.

وەڵام دەداتـەوە: "دەرئەنجامـی زانسـت دوورکەوتنەوەیـە لـە قەدەغەکانـی دیـن و ئەنجامدانـی هەمـوو ئـەوەی ڕایسـپاردووە ئەنجامـی بدەیـن."

شـەمس دەڵێت: "نا!"

هیـچ کـەس بـاوەڕ بـەوە نـاکات کـە دەیبیسـتێت. ئـەم "نا"یـە لـە کۆڵانەکانی قونییـەدا دەنگ دەداتـەوە، چونکـە کـەس لـەو ئاسـتەدا نییـە بـە "مەولانـا"ی مـەزن بڵێت "نـا".

مەولانـا بێ ئـەوەی ئارامیـی خـۆی لەدەسـت بدات، دەڵێت: "دەی باشـە چییـە؟ تـۆ بیڵـێ!"

شـەمس دەڵێـت: "ئامانجـی زانسـت گەیشـتنە بـە ئەفرێنـەر. بـە عیشـق. زانسـتێک کـە بـە عیشـق نـەگات، زانسـت نییـە. ئەگـەر زانسـتەکەت تـۆ بـە عیشـق نەگەیەنێت، نەفامـی لـەوە باشـترە."

مەولانـا ئیتـر دڵنیایـە ئـەو کەسـەی بەرانبەریەتـی، کەسـێکی قووڵـە. بـۆ قسـەکردن بانگهێشـتی دەکات بـۆ کتێبخانەکـەی خـۆی.

کتێبخانەکەی مەولانا ئەفسووناوییە. ئەم بابەتە کە هەموو ئەو کتێبانەی خوێندبوویەوە، هەموو کەسێکی شەیدای ئەو دەکرد.

بەڵام شەمس وا دیار بوو کە هیچ نەکەوتبووە ژێر کاریگەرییەوە. شەمس دەڵێت: "هەمووان دەڵێن تۆ زانایەکی گەورەی... منیش دەمەوێ هەموو ئەوەی تۆ دەیزانی فێری ببم، ئەو پێنج کتێبەی لە هەمووان زیاتر خۆشت دەوێن و بەلاتەوە گرنگن، پیشانم دەدەیت؟"

مەولانا ئەو کارەی شەمس داوای لێ دەکات، ئەنجام دەدات و پێنج کتێبە لە کتێبخانەکەی دادەگرێت. شەمس کتێبەکان وەردەگرێت و سەیریان دەکات، پاشان کتێبەکان هەڵدەداتە ناو حەوزێکی بچووکەوە کە لەبەردەم کتێبخانەکەدا بووە.

مەولانا بۆ ئەوەی کتێبەکان لە ناو ئاوەکە دەربهێنێتەوە، خێرا بەرەو لای حەوزەکە ڕادەکات، بەڵام مەرەکەبی کتێبەکان بەناو ئاوەکەدا بڵاو دەبێتەوە.

شەمس دەڵێت: "ئەوەی تۆ بەدوایدا دەگەڕێیت لەو کتێبانەدا نییە. ئەوەی تۆ بەدوایدا دەگەڕێی بە خوێندنەوە بەدەست نایەت، تەنها دەتوانی بە دڵت بیدۆزیتەوە. تەواوی ئەو کتێب و ئەژمار و نووسینانەی لە دونیادا هەن، گەمەن. گەمەکانی زەینی مرۆڤ... هیچ کام لەم وشە، ڕستە و قسانە ناتوانن جێگەی عیشق بگرنەوە. لەوانەیە بە خوێندنەوە فێر ببیت، بەڵام تەنها بە عیشق دەتوانی تێبگەیت."

مەولانا بە بیستنی ئەم قسانە وشک دەبێت. بێدەنگ دەبێت و گوێ ڕادەگرێت.

شەمس دەڵێت: "قەڵەم بشکێنە، لەمەودا سەفەرمان سەفەری عیشقە. قەڵەم ناتوانێت عیشق بنووسێتەوە و لە کتێبەکانیشدا ناتوانی هیچ شوێنەوارێک لەو بدۆزیتەوە. ئیتر واز لە کتێبەکان بێنە و خۆت هەڵدەرە زەریای عیشقەوە. ئەو ئاگاییانەی کە تۆیان تا ئێرە هێناوە، لەمەودوا دەبنە بەربەست لەبەردەم چوونە پێشەوەی تۆدا. ڕەها کردن و دەستکێشانەوە لەوان بە گیان بکرە."

لە کۆتاییدا مەولانا هەست دەکات سەرچاوەی ئەو ئاگاییەی ساڵانێکی زۆر بوو تینووی بوو پەیدا کردووە. مامۆستا، هاوڕێ و هاودڵی ئەو دواجار هاتبوو.

دەیزانی کە ئەم ڕێگەیە دژوار دەبێت.

دەیتوانی بە فێربوونەکانی لە ڕێگەی زانستدا پێشڕەوی بکات. بەڵام بۆ پێ خستنە سەر ڕێگەی عیشق دەبوو شێوازێکی جیاواز هەڵبژێرێت کە ئەم بابەتەیش تەنها شەمس دەیتوانی بیری ئەوی بخاتەوە.

مەولانا ڕازی نەبوو لە پشت دەرگای زانستەوە بمێنێتەوە. پێشڕەویی لە ڕێگەی عیشقدا هەڵبژارد. ڕازی بوو دەست لە تەواوی ئەوەی فێری بووە هەڵبگرێت. ڕەخنە و تۆمەتی بێدینیشی بە گیان کڕییەوە. بەڵام دەستی لە سەفەری عیشق هەڵنەگرت. چونکە دەیزانی عیشق مرۆڤ دەسووتێنێت، بەڵام ئەم سووتانە دەبێتە هۆی گەورەبوون و پێگەیشتنی ڕۆح.

هەر بۆیە کاتێک لە سەفەری عیشقدا چووە پێشەوە، وتی: کاڵ بووم، کوڵام، سووتام!

**ئەو بەرهەمانەی لە مەولانا بەجێماون:**

مەسنەوی

دیوانی شەمس "دیوانی گەورە"

تێیدایە ئەوەی تێیدایە "فیە ما فیە"

کۆڕی سەبا

مەکتوبات (نامەکان)



تۆ پێ بخەرە سەر ڕێگە و

هیچ مەپرسە.

خودی ڕێگاکە پێت دەڵێت

چۆن دەبێت بڕۆیت..."



## پێشەکییەک بۆ نەینامە

### هەژدە دێڕی سەرەتای مەسنەوی

زانای دین و ئەستێرەناس شەمسەدین ئەحمەد ئەفلاکی کە لە سەدەی ١٣٠٠ زایینیدا دەژیا و ساڵانێکی زۆری تەمەنی بۆ نووسینی کتێبی مەناقیبولعارفین سەبارەت بە مەولانا و مەولەوییە تەرخان کردبوو و ئەم کتێبە وەک یەکێک لە سەرچاوە باوەڕپێکراوە دێرینەکان دەناسرێت، وتوویەتی، مەولانا هەدە دێڕی سەرەتای مەسنەوی بە دەستی خۆی نووسیوە و دێڕەکانی تری مەسنەوی بە دەستی حیسامەدین چەلەبی کە خودی مەولانا ڕایسپاردووە، نووسراونەتەوە.

لە کن پەیڕەوانی مەولەوی ئەوەی کە هەژدە دێڕی سەرەتای مەسنەوی، بەدەستی مەولانا خۆی نووسراون، زۆر بەهادارە. سۆفیانێک بوونیان هەیە کە بەم هەژدە دێڕەی مەسنەوی دەڵێن دڵی مەسنەوی. سۆفیانێکیش بوونیان هەیە کە دەڵێن ٢٥ هەزار و ٦٨٢ دێڕەکەی تر هەموویان ڕوونکردنەوەی ئەم هەژدە دێڕەی سەرەتان.

باشە پرسیارەکە لێرەدایە؛ ئەو هەژدە دێڕە باس لە چی دەکەن؟

بەڕاستی نەی دەری دەبڕێت...

هەر بۆیە ئەم هەژدە دێڕەی سەرەتای مەسنەوی 'نەینامە'یشی پێ دەوترێت.

سەرئەنجام سازی نەی بۆ پەیڕەوانی مەولەوی و سۆفییەکان وەک ئەو فووەی کە لە ڕۆحی خوداوە کراوەتە ناو گیانی مرۆڤەوە، بەبایەخە، چونکە ئەو بە پارچەیەکی جیانەکراوە لە خۆیان دەزانن. چونکە سازی نەی نەک تەنها بەهۆی نەوای ژەنینییەوە، بەڵکوو بەهۆی ئەو چیرۆکانەی کە دەیگێڕێتەوە و پێگەی لە مەسنەویدا هەڵگری ڕاز و ئاگاییەکانە.



ڕێگەی زۆر بۆ

گەیشتن بە خودا هەن،

بەڵام من عیشقم هەڵبژارد...*



# دێڕی یەکەم

## گوێبگرە لە نەی کە حیکایەت دەگێڕێتەوە

## لەدەست جودابیەکان سکاڵا دەکات

**گوێبگرە!**

دوای سەرەتا جوانەکەی قورئانی پیرۆز بە دەربڕینی "بخوێنە"، ئەمە دەتوانێت بەهادارترین بانگهێشتکردنی مرۆڤ بێت.

مرۆڤ دەکرێت بتوانێت لە هەر "بوون"ێکدا چاکە و ئەزموون بخوێنێتەوە. بە دەربڕینێکی تر یەکێک لە پێوەرەکانی پێگەیشتنی ئینسانی ئەوەیە کە بتوانێت ئەم چاکەیە ببینێت و ئەوەی ئەم ئەزموونە دەیەوێت بیڵێت، ببیستێت...

مەولانا لە پێشەکیی مەسنەویدا بەم جۆرە دەدوێت کە "ئەم کتێبە ڕۆشناییبەخشی هەموو ئەو شتانەیە کە ڕازە ئیلاهییەکان ئاشکرا دەکات."[1]

---

١- نووسەر لێرەدا ئاماژە بە یەکەم ڕستەی عەرەبیی مەولانا لە پێشەکیی مەسنەویدا دەکات کە وەرگێڕانەکەی بەم جۆرەیە: «ئەمە کتێبی مەسنەوییە کە کتێبێکە بنەماکانی دین دەگرێتە خۆی و بۆ ئاشکراکردنی ڕازەکان و گەیشتن بە ڕاستی و دڵنیایی.»

راستییەکەی ئێمە باس لە ڕۆچوون بە نێو قوڵایی کتێبێکدا دەکەین کە پڕە لە ڕاز. دەبێت بە هەستیارییەکی زۆرەوە لەبارەی هەر دێڕ و هەر بەیتێکەوە ڕاوەستین و بهزرین.

**گوێبگرە.**

لە دێڕی یەکەمی مەسنەویدا گوێبگرە، واتا گوێ ڕادێرە!

هەر کەس کتێبەکە دەکاتەوە، ڕووبەڕووی ئەم وشەیە دەبێتەوە.

دەستبەجێ ئەم پرسیارە لە زەینی خوێنەردا دروست دەبێت: گوێ بۆ چی ڕادێرین؟

بەڵام لەوە تێناگات کە وەڵامەکەی لە دڵی پرسیارەکەدا شاردراوەتەوە.

گوێبگرە، بەڵام لە چی؟

ئەی مرۆڤ گوێبگرە، گوێ لە نەوای نەی ڕادێرە...

لە زمانی فارسیدا "بشنو : گوێبگرە" بە واتای گوێ ڕادێرانە.

سەرەتای مەسنەوی بە پیتی "ب" زۆر گرنگە. هەموو سورەتەکانی قورئانی پیرۆزیش بە پیتی "ب" دەست پێ دەکەن. سەرەتای هەموو سورەتەکان بە "بسم الله الرحمن الرحیم" دەست پێ دەکات. تەنها سورەتێک کە بەم دەستەواژەیە دەست پێ ناکات، سورەتی تەوبەیە کە ئەویش بە "براءة" دەستی پێ کردووە کە لەوێیشدا بە پیتی "ب" دەستی پێ کردووە.

دەی ڕازی پیتی "ب" چییە؟

بۆچی مەولانایش بە وشەی "بشنو: گوێبگرە" مەسنەوی دەست پێ کردووە؟

سۆفییەکان لەو باوەڕەدان ڕازی بوونەوەر لە قورئاندا شاردراوەتەوە. ڕازی قورئان لە بسم الله الرحمن الرحيم ی سەرەتای سورەتی فاتیحەدایە، ڕازی بسم الله الرحمن الرحيم لە پیتی "ب" و ڕازی پیتی "ب" لە نوختەکەی ژێریدایە.

لە زمانی عەرەبیدا پیتی "ب"بەم شێوەیە دەنووسرێت: **ب**

نوختەی ژێر "ب" دەربڕی چییە؟

دەی مێشکی مرۆڤ دەکرێت ئەم پرسیارە نەکات: بۆچی ئەو ڕازە گەورەیە لە نێو ئەم خاڵە بچووکەدایە؟

ئەمڕۆکە دەزانین کە جیهانیش لە گەردیلەی زۆر ورد بەناوی ئەتۆم پیکهاتووە. زانایانیش لەو باوەڕەدان ئەو دونیایەی ئێمە تیایدا دەژین، لە یەک تاکخانەوە دروست بووە و بە تێپەڕینی کات گەشەی سەندووە و تەنانەت سەلماندوویانە کە هەر ئێستاکەیش لە باری پەرەسەندن و فراوان بووندایە. لەبەر ئەوە بە پێی زانست هەموو شتێکان پەیوەستن بە یەکەوە...

سۆفییەکانی لەو باوەڕەدان کە هەموو شتێک لە لایەن خوداوەیە، پارچەیەکە لە خودا و لەوەوەیە و بەرەو لای ئەو دەگەڕێتەوە.[1] نوختەکەی ژێر پیتی "ب" بۆ ئێمە دەربڕی ئەوەیە کە هەموومان و هەموو شتێک پارچەی جیانەبووەوەی یەک پارچەیەکین کە دەبێت ئاگاداری ئەم بابەتە بین و بە شێوەیەکی قووڵ لەم پرسە تێبگەین.

١- انا لله و انا اليه راجعون - ئایەتی ١٦٥، سورەتی بەقەرە.

ئەم ڕستەیەی حەزرەتی عەلی "سڵاوی خودای لەسەر بێت" بە یاد بهێنینەوە کە دەڵێت: "زانست خاڵێک بوو، بەڵام نەفامان بوونە هۆی گەورەکردنی (زیادکردنی)."



"دڵۆپە مەبە،

خۆت بکە بە زەریا.

ئێستا کە بیری زەریا دەکەی،

دڵۆپە ئاو لەنێو بەرە."



## ڕازی پیتی "ب"

حەزرەتی مەولانا لە هەمان سەرەتای مەسنەویدا، بە وتنی وشەی "بشنو : گوێبگرە" چ ڕازێک لە پیتی "ب"دا بۆ ئێمە ئاشکرا دەکات!

سۆفییەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە گرنگترین ڕەگەزی تەسەوف هاودەمی و خزمەتە. هاودەمییش کاتێک دەکرێت کە بیسەرێکی باشت هەبێت. گوێڕادێران و بیستنی بابەتێک تەواو جیاوازن لە یەک.

گوێی تەندروست هەموو شتێک دەبیستێت، بەڵام ڕەنگە نەتوانێت گوێ ڕادێرێت. گوێڕادێران تەنها بە گوێ نییە، بەڵکوو هاوکات بە زەین، تەرکیز، هەستەکان، تێگەیشتن، هەبوونی ئامادەیی، دڵ، سەنگینی، لەسەرخۆیی و دیسان ئاگاییەوە پەیوەستە. بە شێوەیەکی گشتی گوێڕادێرانیش لە تەسەوفدا جۆرێک مامۆستایەتییە. دەبێت فێری ببیت و تیایدا بچیتە پێشەوە.

خزمەتیش واتا بێ ئیرەیی بردن بەوەی گوێت بۆ ڕادێراوە، ئەوەی دەیزانی بە دڵفراوانی و بێ هیچ دژوارییەک لەگەڵ ئەوانی تردا بەشداری پێ بکەیت و بێبەشیان نەکەیت.

لەبەر ئەوە ناکرێت بوترێت کە مەولانا بە بەکارهێنانی وشەی "بشنو : گوێبگرە" بۆ ئەوەی ویستوویەتی بیڵێت، بێ ئامانج و مەبەست نەبووە. لە هەر دێڕێکی مەسنەویدا ڕازێک شاردراوەتەوە... بۆ کەسێک کە بتوانێت تێی بگات... بۆ کەسێک کە دەزانێت دەبێت گوێ لە نەوای نەی بگرێت...

دەتوانم بڵێم کە بناغەی تەسەوف "مامۆستایەتییە لە گوێڕادێراندا".

لە ڕاستیدا لە کەلتووری خۆیشماندا چەند پەندێکی پێشینان هەن کە بایەخی گوێڕادێران بیر دەخەنەوە.

**"ئەگەر قسەکردن زیو بێت، بێدەنگی زێڕە."**

**"هەزار جار گوێبگرە و یەک جار قسە بکە."**

ئەمانە ئەو پەندە پێشینانەن کە بایەخی گوێڕادێرانمان بۆ ئاشکرا دەکەن. مرۆڤ کە سەبارەت بە بوونەوەرانی تر هۆش و توانای قسەکردنی هەیە، یان باشترە بڵێم توانای بەدیهێنانی زمانی جۆراوجۆری هەیە، بە بێدەنگی دەتوانێت لە ڕێگەی پێگەیشتندا بچێتە پێشەوە نەک بە قسەکردن. ئەو کەسەی گوێدەگرێت، فێر دەبێت. ئەو کەسەی گوێدەگرێت، دەتوانێت بڕیار بدات چ کارێک ئەنجام بدات یان چ کارێک ئەنجام نەدات. توانای بەڵگەهێنانەوەی کەسێک کە زیاتر گوێ دەگرێت، بەهێزتر دەبێت. ئەوە مرۆڤی بەئاگایە، گەورە دەبێت،

دەچێتە پێشەوە، دەگۆڕێت و لە هەمووی گرنگتر بەسەر هونەری بیرکردنەوەدا زاڵ دەبێت، چونکە "بیرکردنەوە" تەنها کارامەییەکی زەینی نییە؛ قۆناغێکە دەبێت بە دڵیشت گوێی بۆ بگریت و ئەوەی دێتە پێشەوە لێی تێبگەیت و قەبوڵی بکەیت. دڵیشت توانای بڕیاردانی هەیە.

هونەر ئەوە نییە کە باش قسە بکەیت، هونەری ڕاستەقینە ئەوەیە کە بیسەرێکی باش بیت. چونکە ئەو کەسانەی باش و کاریگەر قسە دەکەن، هەمیشە ئەو کەسانەن کە دەتوانن بیسەرێکی باش بن.

**ئەو کەسانەی بیسەر نەبن، ناتوانن فێر بن؛**
**ئەو کەسانەی فێر نەبوون، ناتوانن بناسن؛**
**ئەو کەسانەی نەتوانن بناسن، ناتوانن ببیستن.**
**بەڕێکەوتن لە ناسینەوە دەست پێ دەکات و**
**ناسینیش لە گوێگرتنەوە دەست پێ دەکات.**

مرۆڤی ئەمڕۆکە لە هەر لایەکەوە لە پەلەپەل و خێراییدا دەژی، بەدوای ئەوەوەیە کە هەر شتێک بە ئاسانی فێر ببێت. بێ ئەوەی گوێ ڕادێرێت دەیەوێت فێر ببێت. بێ تێگەیشتن لە شتێک دەیەوێ بەکاری بهێنێت، دەستبەجێ دوای بەکارهێنانی خەونی سەرکەوتن و براوە بوون لە سەریدا پەروەردە دەکات. چ خەونێکی بێهوودە و چ چاوەڕوانییەکی نابەجێیە...

ڕۆحی بەغدادی دێڕێکی گرانبەهای لە وەسفی کەسانی نائارامدا هەیە:

**"بڕوانە کێ دەڵێت من لەسەر ڕێگەی ئیرشاد و تەقوام دوێنێ چۆتە قوتابخانە و ئەمڕۆ دەڵێت مامۆستام..."**

دوێنێ بۆ فێربوونی زانست و فێربوون هەنگاوێکی ناوە، ئەمڕۆ دەیەوێ پۆشاکی مامۆستایەتی لەبەر بکات، تەنانەت بیستنیشی پێکەنیناوییە، وا نییە؟

بەداخەوە زەینی مرۆڤ لە هەر بابەتێکدا لەسەر ئەنجام چڕ دەبێتەوە. بڕینی ڕێگە هیچ گرنگییەکی نییە... لە کاتێکدا ژیانیش شەیدای ڕێگەیە، ئەوەی کە چۆن بیشمریت پەیوەندی بە شێوازی تەیکردنی ڕێگەوە هەیە.

ئەوەی کە چۆن ببیت بە مامۆستا، پەیوەندی بەوەوە نییە کە چەندێک لەو ڕێگەیەدا چووبیتە پێشەوە، بەڵکوو پەیوەندی بەوەوە هەیە کە چۆن چووبیتە پێشەوە... بەدرێژایی ڕێگە چ شتێکت بۆ ناو دەفری زەین و دڵی خۆت زیاد کردووە کە پلەی مامۆستایەتیت پێ ببەخشێت.

لە ڕێگەی ژیاندا گرنگ نییە چەند سەعات وانەت خوێندووە! گرنگ ئەوەیە کە چۆن گوێت لەم وانانە گرتووە و چەندێک لێیان تێگەیشتووی.

گرنگ نییە چەند هەنگاوت ناوە؛

گرنگ ئەوەیە کە دژوارییەکانی ئەم ڕێگەیە بوونەتە هۆی ئەوەی لە چ شتێک تێبگەی.

گرنگ نییە چەندێک پارەت بەدەست هێناوە؛

گرنگ ئەوەیە کە بوویتە هۆی ئەوەی ئەوانی تر چی بەدەست بهێنن.

گرنگ نییەکەی لە دونیا دەڕۆیت؛

گرنگ ئەوەیە کە ژیانت چۆن بەسەربردووە.

ئەو مرۆڤەی تەرکیز لەسەر ئەنجام دەکات، یان بیری چۆتەوە ئەو زەحمەتەی لە ڕێگەدا کێشاویەتی دەتوانێت ئەنجامەکە بگۆڕێت، یان نایەوێ بیری خۆی بهێنێتەوە.

چونکە سەدەی نوێ، سەدەی خێرایی و پەلەپەلە...

سەرەڕای ئەوەیش سەدەی خێرا گەیشتنیشە...

بۆ هەرکەس و هەر شتێک جێگرەوەیەک بوونی هەیە. تۆ نەبیت، ئەوی تر... ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر تۆ نەبیت، ئەوی تریش بوونی نییە.

**"دەمکێشان" بەو واتایە نییە لە شوێنێک ڕاوەستی و چاوەڕوان بمێنیتەوە...**

**سەرەڕای وەستان و بێدەنگی، ڕاستییەکەی خەریکی ئەنجامدانی کاری زۆرە کە ئەمەیش هونەرێکی تری مامۆستایەتییە...**

دەمکێشان بیستنی دەنگە لە بێدەنگیدا، ئەزمونکردنی ئاگاییە، پرسیارە، بیر لێکردنەوەیە، هەڵسەنگاندنە، چاوەڕێ بوونە بۆ ئامادەیی بەکارهێنان یان تەنانەت ئامادەبوونە.

دەمکێشان ئەوە نییە لە کاتی خوێندنەوەی کتێبێکدا خەوت لێ بکەوێ. درێژە دانە بە چیرۆکەکە، بەڵگەکاریی قووڵە لەبارەی بابەتێکەوە کە تەنانەت دەکرێت بێ ئەنجام بێت، تێگەیشتنە لە چیرۆکەکە...

سەرەڕای ئەوەیش چ بابەتێک پەسەند بکەیت و چ نەیکەیت، دەتوانی بێ داوەری لێی تێبگەیت. هۆکاری ئەوەی ئەو کتێبانەی خوێندوومانەنەتەوە، زوو لەبیر دەکەین هەر ئەمەیە. ئەگەر دوای کتێبەکە دەمت نەکێشابێ، لەبارەیەوە بیرت نەکردبێتەوە، دادگایی دەروونییت لەبارەیەوە ساز نەکردبێ، لەبارەی ناوەرۆکەکەیەوە ماوەیەک ئەندێشەت دەرگیر نەبووبێت و بە نێو پاڵێوەری زەینتدا ڕەتت نەکردبێت، لە کۆتاییدا لە شەققەی باڵ دەدات و لە مێشکتدا نامێنێت. لەم ڕووەوە خوێندنەوەی کتێبی زۆر و هەستکردن بە غرور بە وتنی "هەفتەی دوو سێ کتێب دەخوێنمەوە" تەنها یاریکردنە بە ژمارەکان. خوێندنەوەی یەک کتێب لە مانگێکدا و دەمکێشانی ناوەرۆکەکەی باشترە لە خوێندنەوەی پێنج کتێب لە هەفتەیەکدا و لەبیر چوونەوەیان.

بەڵام پەلەپەل، یاریکردن بە ژمارەکان، نەبوونی ئارامی و بەدەست نەهێنانی ئەنجام، بەداخەوە دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە مانەوەی کاریگەرییەکان.

هیچ کەس ڕازی نییە ماوەیەکی دوورودرێژ بۆ دەمکێشانی ناوەڕۆکی کتێبێک تەرخان بکات. وتنی "هەفتەی پێنج کتێب دەخوێنمەوە" لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە شیرینترە، سەرەڕای ئەوە دەتوانێت دەرئەنجامی خێراتریشی هەبێت.

من هەمیشە بە فێرخوازەکانم لە یەکەم وانەی فێربوونی نەیدا، ئەمە دەڵێم:

"نەی سازێکە کە زۆر زوو دەخرێتە لاوە. زۆرێک حەزیان لە ژەنینیەتی، زۆرێکیش وازی لێ دەهێنن." بەداخەوە ئەمە ڕاستییەکە.

سالانێکە ژەنینی ئامێری نەی فێردەکەم.

هونەرخوازانی زۆر جۆراوجۆرم بینیوە. هەر یەکەیان پاڵنەرێکی جیاوازیان بۆ دەستپێکردن بەم فێربوونە یان حەزی جۆراوجۆریان هەیە.

ناتوانم لەم بارەیەوە قسە بکەم، نایشتوانم هیچ فەرمانێک دەر بکەم. بەڵام سەبارەت بەوەی کە بۆچی هەندێک دەیخەنە لاوە، دەتوانم بەڕوونی قسە بکەم.

زۆرێک لەوان لەبارەی فێربوونەوە دووچاری پەلەپەل دەبن و کاتێک چاوەڕوانییان بەدی نایەت، دەیخەنە لاوە. ئەوان لەو چاوەڕوانییەدا دەژین هەر کە نەییان گرت بە دەستەوە، بتوانن ئاوازێکی پێ بژەنن. هیچ کەس چاوەڕوانی قەبووڵ ناکات. بەڵام ئەم پەلەپەلە دەبێتە هۆی دواکەوتنی زیاتری ئەوان و تەنانەت خۆیشیان بەم بابەتە نازانن؛ چونکە خەڵک دەم ناکێشن.

تەنانەت کاتێک دەڵێم: "نەی، هونەری فێربوونی ئارامییە" دیسان نایبیستن. ڕوونتر بڵێم، لەم قسەیە تێناگەن؛ چونکە گوێیەکانیان بۆ گوێڕادێران داخراوە.

لەبارەی نەیەوە بابەتە گرنگەکە ئەوەیە کە بتوانی دەنگێکی پاک و ساف بکەیتە ناوییەوە. هەوڵدان بۆ ژەنینی پارچەیەک پێش ئەوەی بتوانی دەنگێکی ساف بکەیتە ناوییەوە، بەرەو شکستت دەبات. شتێک نییە جگە لە بەهەدەردانی کات و وزە. تێکشکاندنی ئامەزرۆییەکە کە پێویست نەبووە...

بەرلەمە بۆ ڕێگرتن لەوەی فێرخوازەکان بکەونە داوی خێرا ژەنینەوە، لەلای مەولانا بەم جۆرە ڕەفتاریان دەکرد.

لە ساڵی یەکەمدا، حەوت کونەکەی نەییان لە ئامێرەکە نەدەکرد. هەر بۆیە فێرخوازان بۆ فێربوونی نەی تا یەک ساڵ تەنها ڕاهێنانیان لەسەر ژەنینی نۆتە سافەکان دەکرد. ئەگەر بیانتوانیایە ئەم کارە ئەنجام بدەن، دەیانتوانی پارچەیەک بژەنن.

لە هەلومەرجی ژیانی ئەمڕۆدا بەکارهێنانی ئەم تەکنیکە ئەستەم دێتە بەرچاو، بەڵام چیرۆکی ئەم بابەتە زۆر گرنگە:

**"ئەنجام" ناتوانێت ئامانج بێت... "ڕەوەند"یش بەشێکە لە ئەنجام؛ چونکە مرۆڤ کاتێک لە ڕێدایە، گەورە دەبێت، ئەستەمە لە پڕێکدا بە هێلی کۆتایی بگات... ئەو کەسانەی بە سینەیان قردێلەی هێلی کۆتایی دەپچڕێنن، کەسانێک بوون ساڵانێکی زۆر لە ڕێگەدا گەورە بوون و گەشەیان کردووە و لەپڕێکدا نەگەیشتوونەتە لووتکە و نەگەشاونەتەوە!**



جگە لە ئێمە کەس نەیدەتوانی

ئێمە لە یەک دوور بخاتەوە،

جگە لە ئێمە کەس نەیدەتوانی

وا لە ئێمە بکات. ئاخ ئەی عیشق،

کاڵ بووم، کوڵام، سووتام.

هیچ کەس جگە لە تۆ

نەیدەتوانی ئاگر لە من بەربدات."



# لە ڕێگەی مامۆستایەتیدا،
# پەلەپەل گەورەترین دوژمنە...

لاوێک لە وڵاتێکی دوورەدەستدا بۆ دۆزینەوەی سۆفییەک بەڕێ دەکەوێت و دەچێت بۆ لای، ڕایدەگەیەنێت کە دەیەوێ ببێت بە قوتابی. سۆفییەکە بە وتنی "دەرگای ئێمە بە ڕووی هەر کەسێکدا کە بێت کراوەیە." قەبووڵی دەکات.

گەنجەکە زۆر وروژاو و خۆشحاڵ دەبێت. لەمەودوا دەبێتە قوتابیی سۆفییەکی بەناوبانگ. لێی دەپرسێت: "دوای چەندێک دەتوانم ببمە سۆفییەکی وەک تۆ؟"

سۆفییەکە لە وەڵامدا پێی دەڵێت: "ئەگەر بەو جۆرەی کە پێویستە گوێم بۆ ڕادێریت و ئەوەی وتم ئەنجامی بدەی، تا دوو ساڵ دەتوانی وەک منت لێ بێت."

قوتابییەکە کەمێک بیر دەکاتەوە و ئەم ماوەیە بەلایەوە درێژخایەن دەبێت، دووبارە دەپرسێت: "ئەگەر زۆر هەوڵ بدەم چەند دەخایەنێت؟"

سۆفی بزەیەک دەکات، بە سەنگینی و زمانێکی شیرینەوە وەڵامی دەداتەوە: "بەو شێوەیە لانیکەم چوار ساڵ کاتت دەوێت."

قوتابییەکە گێژ دەبێت. دەڵێی هەڵەیەک لەم کارەدا هەیە. کەمێک دووچاری گرژی دەبێت.

نەختێک تووڕە دەبێت و دەڵێت: "من باس لە هەوڵی شەوانەڕۆژی دەکەم، ئەگەر پێویست بکات لە خەویش خۆم دەگرمەوە، پێویست بکات نان ناخۆم، ئاو ناخۆمەوە، شەو و ڕۆژ هەوڵ دەدەم. بەم شێوەیە چەندێک دەخایەنێت تا ببمە سۆفییەکی وەک تۆ. ئەمەم پێ بڵێ."

سۆفییەکە هێشتا ئارامە. بە دەنگێکی شیرین و بە پێداگرییەوە دەڵێت: "ئاها... کەواتا تۆ شەو و ڕۆژ بێ ئەوەی بخەوی هەوڵ دەدەیت، وایە؟"

قوتابییەکە ئەم جارەیان بە شەوق و زەوقێکی زۆرەوە دەڵێت: "بەڵێ... بەڵێ... بێ ئەوەی بخەوم هەوڵ دەدەم، شەو و ڕۆژ... هەر کارێک پێویست بێ ئەنجامی دەدەم. کارێک کە هیچ کەسێک نەیتوانیوە ئەنجامی بدات..."

نیگای سۆفییەکە قووڵ دەبێتەوە، وەک بڵێی هاوکێشەیەکی جیددی لە مێشکی خۆیدا شیکار دەکات.

پاشان بەم شێوەیە وەڵام دەداتەوە: "لانیکەم دە ساڵ درێژە دەکێشێت."

ئەوەی دەمەوێ بیڵێم ئەمەیە، لە ڕێگەی مامۆستایەتیدا پەلەپەل کەموکورتییە... تەنانەت گەورەترین دوژمنە... ناتوانیت ڕێبواری ڕێگەیەک بیت کە پێیدا نەڕۆیشتووی. ناتوانیت لەبارەی زەریایەکەوە کە تیایدا نقووم نەبوویت، قسە بکەیت. ناتوانیت لەبارەی دارستانێکەوە کە تیایدا ون نەبوویت بدوێیت. بۆ هەر کەسێکیشی باس بکەیت، باوەڕت پێ ناکات.



پرسی: عیشق لە چ کەسێک دەچێت؟

وتم عیشق لە نەیژەن دەچێت.

پرسی: ئەگەر عیشق لە نەیژەن دەچێت،

کەواتا ئێمە چین؟ وتم: بەڵێ!

ئەگەر عیشق لە نەیژەن بچێت،

ئێمە نەیەکەین...*



# سەفەرێکی درێژی پڕ لە ئەزموون

# لە نەیزارەوە تا دەرگا

حەزرەتی مەولانا کاتێک بناغەی فەلسەفەی سۆفییانی بەیان کرد، گرنگییەکی زۆری بە نەی دا، چونکە نەی لە پشت ئەو نەوایانەوەیە کە دەریان دەبڕێت، ئەو چرکەساتەی لە نەیزاردا بووە سیمبولێکە لە چارەنووسی مرۆڤ.

یەکەم جار کە چیرۆکی نەیم بیست، تەمەنم پازدە ساڵان بوو.

ئەو نمایشە ڕاستەوخۆیەی نەی کە بینیبووم، منی شەیدای خۆی کردبوو. پاشان هەمان ئەو نەیژەنە بووە مامۆستام. ڕەنگە ویستبێتی تەکنیکەکانی فووکردن بە نەیدا فێری من بکات، بەڵام هەروا کە باسی فەلسەفەی نەی بۆ دەکردم، ڕاستییەکەی هەموو شتێکی بۆ ڕوون دەکردمەوە. ئەوکات من گەنجێک بووم لە شاری بورسا دەژیام و نیگەرانی ئایندەم بووم. حەزم لێ بوو نەی بژەنم، وەک هەموو فێرخوازەکانی تر، دەمویست یەکەسەر فوو بە نەیدا بکەم. پێم وابێ مامۆستاکەم بەم پەلەپەلەی منی زانیبوو کە وتی پێش هەر شتێک دەبێت فێری فەلسەفەی نەی ببیت.

لێی پرسیم: 'ئایا چیرۆکی سەفەری نەی کە لە نەیزارەوە دەست پێ دەکات، دەزانی؟ تا هەنووکە کونجکۆڵ بوویت بزانی ئەو لقە نەیەی لە نەیزاردایە، دەبێت چ پرۆسەیەک تەی بکات؟'

مامۆستاکەم ئەو نەیيانەی فووی پێدا دەکردن، بە دەستانی خۆی دروستی دەکردن. بە وتەی سۆفییەکان "خۆی نەیی خۆی دەکردەوە."

نەیژەنەکان زاراوەی "دروستکردنی نەی" بەکارناهێنن، لە جیاتی ئەوە دەڵێن "کردنەوەی نەی" چونکە لەگەڵ نەیەکەدا هەم ڕازەکانیشی ئاشکرا دەکەیت، هەم لە بەربەستەکان تێدەپەڕیت.

مامۆستاکەم هەستایە سەر پێ و چوو بۆ ژوورێکی بچووک کە 'ئاتیلە'ی پێ دەوت.منیش یەکسەر هەستام و سەیری ئەوم کرد.

وتی: 'ئێستا کاتی ئەوە هاتووە باسی زەحمەت و دژوارییەکانی ڕێگەی لقی نەیت بۆ بکەم. کوڕی خۆم، ئێستا باش گوێم لێ بگرە! چونکە ڕازی قووڵ لەم چیرۆکەدا شاردراوەتەوە. بە گوێگرتن لە چیرۆکی نەی لە بیرکردنەوەدا ڕۆدەچیت و شتی تازە لە خۆتدا دەدۆزیتەوە، بەڵام بە ئەندازەی بەشی خۆت.

دەزانی بۆچی مەولانا هەم بۆ سەرەتای مەسنەوی و هەم بۆ دەربڕینی بناغەی فەلسەفەی تەسەوف نەی هەڵبژاردووە؟

لە وەلامدا دەڵێت کوڕەکەم! چونکە نەی زۆر لە مرۆڤ دەچێت. سەفەری نەی تەواو وەک سەفەری مرۆڤ وایە. لە ڕاستیدا پێگەیشتنی نەی، واتا گەیشتن بەو ڕەسايیە (کمال)؛ چیرۆکی

پێگەیشتنی مرۆڤە. نەی سیمبوڵی دەورانی پێگەیشتنی مرۆڤە.

ئێستا تۆ بۆ سەفەرێک دەبەم. تێیدا فێر دەبیت کە بە تێپەڕین لە چ قۆناغگەلێک لقە نەیەکی باریک بۆ سازێکی تەواو دەگۆڕێت."

مامۆستاکەم لقە نەیەکەی بە دەستەوە گرت و پیشانی دام. بە ڕەنگە سەوز و پاراوەکەیدا دیار بوو کە تازە لێکراوەتەوە.

وتی: "سەیرکە کوڕم؛ لە تەنیشت زۆنگاوەکانەوە لقی هاوشێوەی ئەمەت بینیوە. ئەم لقە نەییانە کۆمەڵێک ڕووەکی بێکەڵکن. هیچ لایەنێکی بەسوود یان بەکارهێنانێکیان نییە. بۆ خواردن و خواردنەوە نابن، لە دروستکردنی خانوودا بەکار نایەن... بە شێوەیەکی خۆڕسک لە زۆنگاوەکاندا گەشە دەکەن، کاتێک وەرزیشیان تێپەڕی پەژموورده دەبن و لەنێو دەچن.

بەڵام کاتێک مامۆستای نەی، ئەو لقە نەیە بەدەستەوە دەگرێت، سەفەرێکی زۆر گرنگ و بەهادار بۆ ئەو لقە نەیە دەست پێ دەکات.

مامۆستای نەی کاتێک لقەکە لێ دەکاتەوە، یەکەم جیابوونەوەی نەی لەوێوە دەست پێ دەکات. یەکەم هەنگاوی سەفەری نەی دەردی جوداییە."



وتـی ئارام بگره،

لەسـەر ئەم ڕەنج و میحنەتە،

خودا پاداشتی

ئارامگران دەداتەوە.



## چیرۆکی مرۆڤیش بە جودابیەک دەست پێ دەکات.

مامۆستاکەم بەم شێوەیە درێژەی بە قسەکانی دا: "سەفەری نەی بە جوداییەک دەست پێ دەکات، ئاوازەکەی پڕە لە خامۆشی، شێلگیری و دڵتەنگی." سەرەتا لە مەبەستی تێنەگەیشتم؛ لە دڵی خۆمدا بیرم کردەوە ئێستا بۆچی دڵتەنگی؟ پاشان بڕیار بوو لە پەیوەندیی نێوان نەی و دڵتەنگی تێبگەم.

وتی: "بە ڕەهاکردن و دەست لێ بەردان، لقی نەی بەڕێ دەکەوێت. بیرت نەچێ هەر هەڵبژاردنێک ڕەهاکردنێکە، کاتێک مرۆڤ پێ دەنێتە سەر ڕێگەیەم، دەست لە ڕێگەکانی تر هەڵدەگرێت و ڕەهایان دەکات. بە شێوەیەکی گشتی هەڵبژاردنێک بە واتای ئەوە دێت کە لە هەڵبژاردنەکانی تر بێسنوور دەست هەڵدەگرێت... ئەمە ئەزموونێکی سەختە. دەبێت سەرەتا دەستهەڵگرتن فێر ببێت...

هەر بەو جۆرەی کە من چیرۆکەی نەیم بۆ باس دەکەم، تۆیش هەست بە لێکچوونەکانی چارەنووسی لقی نەی لەگەڵ خۆتدا بکە و بیانناسەرەوە.

سەفەری نەی بە جودایی دەست پێ دەکات. لەبەر ئەوە یەکەم دێڕی مەولانا لە مەسنەویدا بەم جۆرەیە:

گوێبگرە لە نەی چۆن حیکایەت دەگێڕێتەوە

لە دەست جودابییەکان سکاڵا دەکات

ڕۆحی مرۆڤەکانیش لە جیهانی مەعنا جیابوونەتەوە و لە سکی دایکیاندا جێگەیان گرتووە. دوای نۆ مانگ گەشەکردن و گەورە بوون لە سکی دایکدا بەو پەڕی ئاسوودەیی، شادی و ئارامییەوە، دیسان جیا بوونەتەوە و هاتوونەتە ئەم دونیایەوە.

یەکەم کاردانەوەی منداڵی ساوا لە کاتی لەدایکبووندا چییە؟

گریانە، وا نییە؟

بەڵێ... هەموومان لە کاتی لەدایکبووندا سەرەتا گریاوین.

بەهۆی جودابییەوە لەو دونیا جوانەی دایکمان بۆ فەراهەم کردبووین، نارەحەت دەبین، تەنانەت دەگرین و لە چوونە نێو دونیایەکەوە کە هیچ ئاشنایەتییەکمان لەگەڵیدا نییە، دەترسین... جیابوونەوەمان لە دایک ئێمە دەخاتە ناو دونیایەکی گەورەتر و ئەزموونێکی جیاوازترەوە.

ئەم دونیا تازەیە کە نایناسین و بە فێربوون تیایدا گەورە دەبین، هەروەک مەولانا وتوویەتی لە چوارچێوەی "ئازار"دا دێت بۆ سۆراغمان. هەرچییەک بێت نەناسراوە... لە ڕاستیدا ناتوانین بزانین ئەمڕۆ چیمان پێ دەدات یان چ شتێکمان لێ دەسێنێت. سەرئەنجام هیچ شتێک لەژێر کۆنترۆڵی ئێمەدا نییە.

هەڵبەتە لێرەدا دەبێت باش لە وشەی "ئازار" تێبگەین... ئەو ئازارەی لێرەدا قسەی لەبارەوە دەکەین، ئەشکەنجە، ستەم یان مەراق نییە.

ئازارێکی نەناسراوە.

ڕەهاکردنی ناوچەی دڵنیایی و ئاسوودەییە و دەستکردن بە سەفەرێکی درێژە بۆ گەیشتن بە ڕەسایی. ماندوو بوونە، ڕشتنی ئارەقەیە، زەحمەتکێشان بۆ گەشەکردنە، هەوڵدان بۆ گەورە بوونە. بۆ بوونە مامۆستا دەستهەڵگرتنە لە ئاسوودەیی، کەمکردنەوەی خەوە، خۆ تەرخان کردنە، شەیدا بوونی فێربوونە، بەدەستهێنانی ئاگایی عیشق و عاشقبوونی زانستە.

ڕاستییەکەی ئەم ئازارە بە وتەی مەولانا، هەموو ساتێک ڕێگە پیشانی مرۆڤ دەدات.

ئەو ئازارەی لە یەکەم جیابوونەوەی مرۆڤەوە دەست پێ دەکات، بە درێژایی تەواوی تەمەنە. ئەم ئازارە بە درێژایی ئەم ماوەیە، تا دێت خۆشەویستتر دەبێت... کاتێک لەژێر سایەی ئەم ئازارەدا گەورە دەبیت، گەشە دەکەیت و بە پێگەیشتن دەگەیت و لەوەی کە هەیە تێدەگەیت، هەم تامی ئازارەکە لات دەگۆڕێت و هەم پەیوەندیت لە گەڵیدا. نەییش لە یەکەم جیابوونەوەیدا ئازاری خۆی دەناسێت. سەرەتا بەهۆی ناڕوونی دۆخەکەوە، ماوەیەک چاوەڕێ دەکات، دوای ئەوەی لە نەیزار جودا بوویەوە، کەمێک لە چاوەڕوانیدا دەمێنێتەوە، لەو بارودۆخەدا هیچ کارێک ئەنجام نادرێت.

بەم شێوەیە فێری ئارامگرتنیش دەبێت.

لە چاوەڕوانیدایە، چاوەڕوانی... چاوەڕوانی... بەم شێوەیە فێری چاوەڕوانییش دەبێت، فێری ئارامگرتن دەبێت."

مامۆستاکەم هەروا کە ئەمانەی دەوت، لقە نەیەکی تری بەدەستەوە گرت. ئەگەر لەگەڵ لقە نەیەکەی تردا بەراوردمان بکردایە بە ئاسانی بۆمان دەردەکەوت ئەم لقەیان زیاتر لە چاوەڕوانیدا ماوەتەوە. ڕەنگە سەوزەکەی نەمابوو و ئیتر تازە نەبوو...

بە وتنی: "بەڵام ڕێگە بۆ ئەم لقە نەیە کۆتایی نەهاتووە." درێژەی بە قسەکانی دا: "پاشان نۆرەی توێکڵە ئەستوورەکانی سەر لقی نەیە. مامۆستا ئەو توێکڵانەی بە جوانی بە دەوری نەیەکەوە نووساون، لێ دەکاتەوە. ئەم کارە لە ژیانی مرۆڤدا یەکسانە بە هۆشیاریی ڕەها بوون لە ئیگۆکان و منگەرایی و ترس لەوەی ئەوانی تر چی دەڵێن."

دوای ئەوە مامۆستاکەم بە ئارامی دەستی کرد بە لێکردنەوەی توێکڵی لقە نەیەکە. چ توێکڵێکی ئەستوور لەسەر قەدەکەی بوو! ڕاستییەکەی مامۆستاکەم هەر چەندێک پێستەکەی لێ دەکردەوە، جوانیی نەیەکە زیاتر دەردەکەوت.

مامۆستاکەم وەک بڵێی ئەوەی بە مێشکمدا تێپەڕیوە بیستبێتی، وتی: "نەی هەر چەندێک لە توێکڵەکانی ڕزگار ببێت، زیاتر خودی ڕاستەقینەی دەردەکەوێت. مرۆڤیش لە سەفەری تەسەوفدا، واتا لەو ڕێیەدا کە بەرەو پێشکەیشتنی ئەو دەچێتە پێشەوە، کاتێک لە ئیگۆ و منەگەرایی ڕزگاری دەبێت، تازە پێ دەنێتە سەر ڕێگە. یەکەم هەنگاوی ئەم

سەفەرە، ڕزگار بوونە لە ئیگۆکان. ئەوەی کە بتوانی خۆت بیت. تا تۆ نەبیت بە خودی خۆت، تا بە حەقیقەتی خۆت نەگەیت، ئەستەمە بتوانی لەم ڕێیەدا بچیتە پێشەوە. هەر لە شوێنی خۆتدا دەمێنیتەوە و بێهوودە ماندوو دەبیت. لەبەر ئەوە دەبێت لە توێکڵەکانت ڕزگار ببیت.

لقی نەی دوای ئەم قۆناغەیش دیسان لە چاوەڕوانیدا دەمێنێتەوە، دیسان لە چاوەڕوانیدا دەمێنێتەوە و دووبارە فێری ئارامی دەبێت. لە فێربوونی ئارامیدا زۆر گەشە دەکات.

پاشان دەچێتە قۆناغی دواترەوە. بەشی ناوەوەی لقی نەی زۆربەی جار پڕە. مامۆستای نەی بە ئاسنێکی سوورەوەکراو ناو لقی نەی بەتاڵ دەکات. بەم شێوەیە بەشی ناوەوەی لقی نەی دەکرێتەوە. بۆشاییەکی قووڵ دروست دەبێت. واتا هیچ دروست دەبێت."

مامۆستاکەم شیشێکی بە دەستەوە گرت و دەستی کرد بە بەتاڵکردنی ناوەوەی نەیەکە. کەمێک دواتر ئەو شیشە سوورەوەکراوەی دەیکرد بە ناو نەیەکەدا ، لەوسەری تری نەیەکەوە هاتە دەرەوە.

بەم شێوەیە ناوەوەی نەیەکەیش پاک بوویەوە. هەروا کە لقە نەیە بەتاڵەکەی پیشانی من دەدا، وتی: "سەیرکە، ئەمە ناوی 'هیچ'ە. نەی ئیتر لە ڕێگەی تەسەوفدا دەست بە دەربڕینی هیچ دەکات، بەتاڵبوونی نەی یەکسانە بە چەمکی 'هیچ' لە تەسەوفدا."

پاشان وتەیەکی شەمسی تەورێزیمان بەیاد هێنایەوە:

لەم دنیایەدا کە هەمووان بە دوای ئەوەوەن ببن بە کەسێک، تۆ ببە بە هیچ... ماڵەکەت هەمیشە بۆشایی بێت... مرۆڤ نابێت جیاوازی لەگەڵ گوڵدانێکدا هەبێت. ئەوەی دەبێتە هۆی بە ساغی مانەوەی گوڵدانێک، شێوەی ڕواڵەتیی نییە، بەڵکوو بەتاڵبوونی ناوەوەیەتی. لەبەر ئەوە، ئەوەی کەسێک دەکات بە مرۆڤ هەستی منگەراییەکەی نییە؛ بەڵکوو هۆشیارییەتی سەبارەت بە هیچ بوونی.

مامۆستاکەم وتی: "بەم جۆرەیە کوڕەکەم، دوای کونکردن و بوونی بە هیچ، نەی دیسان ماوەیەک لە چاوەڕوانیدا دەمێنێتەوە."

پاشان مامۆستاکەم ئەو نەیەی بە دەستییەوە بوو، لەسەر زەوی دانا، ئەم لقە نەیە لەچاو ئەوەی پێشوودا زیاتر پێگەیشتبوو و ڕەنگی ڕوو لە زەردی بوو. بە شیشێکی سوورەوەکراو دەستی بە دروستکردنی کون لەسەر قەدی نەیەکە کرد.

وتی: "ئەمەیش قۆناغێکی تازەیە. مامۆستای نەی بە یارمەتیی شیشێکی سوورەوەکراو لەسەر نەی حەوت کون دروست دەکات. چونکە دوای بەدیهێنانی ئەم کونانە نەغمە سرووشبەخشەکان دەتوانن بۆ دڵەکان بێنە دەرەوە و لە کۆتاییشدا سەر و بن[1] کە نیشانەی پێگەیشتن و مامۆستایەتیی ئەون، پێیەوە پەیوەست دەکرێت.

ئێستا ئەو نەیەی لە توێکڵەکەی ڕزگاری بووە، بووە بە هیچ و حەوت کونی تێ کراوە، بە قۆناغی کۆتایی خۆی گەیشتووە.

١- بەشەکانی سازی نەی.

لقی نەی کە لەبەر خۆیەوە بیری لەوە دەکردەوە کە "مردم، لەنێو چووم، بۆچی بەرگەی ئەم هەموو ئازارەم گرت." دوای ئەوەی بە فووی نەیژەن ئاوازی شیرین و خۆشی دەنگی دایەوە، تێدەگات ئەم هەموو ئازارە، ئەو هەموو پەرێشانی و ئەو هەموو سەختییە بێهوودە نەبووە. نەی لەم قۆناغەدا بەرانبەر خۆی حەسەپاوە. لە دڵی خۆیدا وا بیر دەکاتەوە کە "هیچ کام لەو شتانەی بە سەرمدا هاتن بۆ لەنێوبردنی من نەبوون." لەبەر خۆیەوە دەڵێت: "هەموو شتێک بۆ پێگەیشتن و بە ڕەسایی گەیاندنی من بوو."

مرۆڤیش لەم ڕووەوە زۆر لە نەی دەچێت. کاتێک لە ئیگۆکانی خۆی ڕزگار دەکات و دەست لە من منەکانی هەڵدەگرێت، دوای تێپەڕینی حەوت قۆناغ، نەفس بە هۆشیاریی هیچ بوونی خۆی دەگات، دوای تێپەڕاندنی ئەم قۆناغانە، هەر بەو جۆرەی لە قورئاندا هاتووە "لە ڕۆحی خۆم کردە ناو جەستەیەوە." نەیژەنیش کاتێک دەست بە فووکردن بە نەیدا دەکات، دەرگاکان دەکرێنەوە.

هەر بەو جۆرەی کە نەی ئامادە دەبێت و بە ڕەسایی دەگات، بەو هەناسەیەی کە بەدیهێنەرەکەی پێیدا دەکات، توانا نووستووە دەروونییەکانی دەست بە بێداربوونەوە دەکەن. ئەو هونەرانەی کە تەنانەت بە شوێنیشیانی لە ناخی خۆیدا نەدەزانی، دەست بە دەرکەوتن دەکەن.

تۆ خاوەنی توانایەکی کە کەسێکی تر ئەو توانایەی نییە. کاتێک بتوانی ئاشکرای بکەیت و ئەوەی لە تۆدایە ئاشکرای بکەیت، ناوازە دەبیت.

هەر بەو جۆرەی کە لقی نەیەک ناوازە دەبێت...

جیاوازی نییە مامۆستای نەی سەد نەی بکاتەوە یان هەزار دانە. لە کۆتاییدا دەبینێت هەر کامیان ئاوان، هەست و لەشێکی جیاوازی هەیە، شتێکی ترە. هەر کامیان خەسڵەتی تایبەت بەخۆی هەیە.

لەبەر ئەوە زۆر گرنگە کە مرۆڤ بتوانێت خودی ڕاستەقینەی خۆی بێت. بەم جۆرە دەتوانێت خەسڵەتیی تایبەت بەخۆیشی بدۆزێتەوە.

**جیهان وەک پازڵێکی گەورە وێنا بکە. هەر کام لە ئێمە پارچەیەکی بچووکین لەم پازڵە. هەر کاممان خەسڵەتی تایبەتمان هەیە. بەڵام لەو کاتەدا کە دەست بە لاسایی کردنەوەی ئەوی تر دەکەین، جێگەی دروستی خۆمان لەم پازڵەدا ون دەکەین و لەمەیش خراپتر ئەوەیە کە ناتوانین جێیەکی دروست بۆ خۆمان بدۆزینەوە.**

**تەنها کاتێک دەتوانین بەو شوێنانەی پێیەوە پەیوەستین بگەین کە خودی ڕاستەقینەی خۆمان بین.**

**لەم کاتەدایە کە من ناوازە دەبم؛ تۆ ناوازە دەبیت.**

لەم کاتەدایە ناوە ئامادەکانی خودا لە تۆدا ئاشکرا دەبن.

قسەکانی مامۆستاکەم زۆر منیان خستە ژێر کارگەرییەوە. دوای ئەوەی بە شێوەیەکی تێروتەسەل چیرۆکی دروستکردنی نەیەکی بۆ گێڕامەوە، ئەو نەیەی خۆی دروستی کردبوو، بە دەستەوە گرت و دەستی کرد بە فوو پێداکردنی...

منیش لەم کاتەدا دەستم کرد بە بەرجەستەکردنی سەفەری لقێک نەی لەبەر چاوانمدا.

بە جوداییەک، بە دەستهەڵگرتنێک و ڕەهاییەک چیرۆکی نەی دەستی پێ کردبوو. مرۆڤیش هەندێک جار ئەم ئازاری جوداییە بێ ئەوەی خۆی بیەوێت ئەزموون دەکات و ئەم جوداییە لە ڕاستیدا ئەو بە مەعنەوییەتی خۆی دەگەیەنێت. جیابوونەوەی لقی نەی لە سەرەتادا زۆر ئەوی ناڕەحەت کردبوو. بەڵام پاشان فێری "ئارامگرتن" بوو.



"ئازار هەمیشە

ڕێت

پیشان دەدات..."



# ئارامگرتن...

هەر مرۆڤێک لە قۆناغێک لە ژیانی خۆیدا بە ئارامگرتن تاقی دەکرێتەوە. لە هەر ئەزموونێکی نوێدا، هەر هاتنێک، هەر سەرەتایەک، هەر بیرکردنەوەیەک، هەر نیازێک، هەر نزایەک و لە هەر هەنگاوێکی نوێدا ڕووبەڕووی قۆناغێک لە شایستەیی دەبێتەوە، بە قۆناغێکدا تێدەپەڕێت کە دەبێت ئارام بگرێت.

چونکە دەبێت بۆ هەر نیازێک، هەر هەنگاوێک، هەر نزایەک، هەر بیرکردنەوەیەک، هەر هاتنێک، هەر سەرەتایەک شایستەییت هەبێت. هەر وەک فووکردن بە نەیدا...

لەو خوولانەدا کە بۆ هونەرخوازەکانم سازی دەکەم، داوایان لێ دەکەم ئەم وشەیە بکەن بە ئەڵقەی گوێیان "ئارامگرتن". دەڵێم: "هاوڕێیان، نەی چاوەڕێ دەکات تا شایستەی بیت. هەربۆیە هیوادارە کە ئارامگرتن بکەیت بە پیشە، هەوڵ بدەیت و هەرگیزاوهەرگیز دەست هەڵنەگری. ئەمە ئەزموونێکە کە بە درێژایی ژیان ئەگەرچی هەستیشی پێ نەکەیت، ڕووبەڕووی دەبیتەوە، هەروەک چۆن لە فووکردن بە نەیدا ڕووبەڕووی دەبیتەوە."

دەبێت بۆ ئەو نەوا دڵگیرە خودایيە، هۆشیارییە نووستووەکانی ناو ئەو نەوایە، ئەو پەیامە، ئەو زانینە، ڕاهاتن بەو ئازارە و تێگەیشتن لێی شایستەییت هەبێت. بۆ ئەم مەبەستە سەرەتا دەبێت گوێڕادێریت، پاشان ئارامگرتن بکەیت بە پیشە و هەوڵ بدەیت، شایستەیی بەدەست بخەیت و شیاوی بیت.

هەبوونی شایستەیی سیستەمێکە دەبێت باش لێی تێبگەیت. هەر لەبەر ئەمەیە کە هەر لایەنێکی ژیان و هەر ئەزموونێک بە ئارامگرتن تاقی دەکرێتەوە.

پارەت دەوێ؟

شیاوی بە...

دەپرسی چۆن؟

بە ئارامگرتن...

عیشقت دەوێ؟

شیاوی بە...

دەپرسی چۆن؟

بە ئارامگرتن...

سەرکەوتنت دەوێ؟

شیاوی بە...

دەپرسی چۆن؟

بە ئارامگرتن...

مامۆستایەتیت دەوێ؟

شیاوی بە...

دەپرسی چۆن؟

بە ئارامگرتن...

دەتەوێ نەی بژەنی؟

شیاوی بە...

دەپرسی چۆن؟

بە ئارامگرتن...



ئارامگرتن وەک ڕیسمانێکە
کە پێت وایە دەپچڕێت،
بەڵام تا دێت بەهێزتر دەبێت.
وا هەست دەکەی تەواو دەبێت،
بەڵام تا دێت زیاتر دەبێت.



# مامۆستایەتی

لە مامۆستایەکیان پرسی: "چۆن بووی بە مامۆستا؟"

وەڵامی دایەوە: "ئەزموونەکانم، ئەزموونەکانم..."

تەمەن هیچ گرنگییەکی نییە؛ ئەوەی کە بایەخی هەیە ئەزموونە. ئەو شتەی مرۆڤ دەکات بە مامۆستا چەند ساڵ تەمەنکردنی نییە؛ چۆنییەتی ژیانییەتی. چ شتێک فێربوو، چۆن گواستییەوە و چەندێک لە ڕووی چاکەوە بەکاری هێنا.

ئەوەی مەولانا وەک "ئازار" یاخود بە دەربڕینێکی تر وەک ئەزموونی ژیان باسی دەکات، تەواو بۆ پێگەیشتنی مرۆڤە. هیچ پەرێشانییەک، ئەشکەنجەیەک یان ستەمێک نییە. کۆمەڵە فێربوونێکە کە ئاسوودەیی مرۆڤی لەنێو بردووە و بەم تێکدانە بۆشاییەکی ڕووبەڕووبوونەوەی گەورەی پێ دەدات تا بە ڕەسایی بگات.

ئەوەی کە لە فێربوونی ئەم ئازارەدا، چەندێک و چۆن ماسوولکەکانت بەکارهێناوە، واژووی تۆ دەبێت لەم دونیایەدا.

چ پێی بزانیت و چ پێی نەزانیت، هەر ئەزموونێک کە پێیدا تێدەپەڕیت فێربوونێکی ژیانە. ئەگەر موسافیرێکی خاوەن ئیرادە، تێکۆشەر و تەندروست بیت، لەم فێربوونانە تێدەپەڕیت و بە مامۆستایەتی دەگەیت.



ئەی گیان!

مرۆڤی گونجاو شـادی و

مرۆڤی نەگونجاو ئەزموون

لـەدوای خۆی بەجێ دەهێڵێت.

هیچ شـتێک لە ژیاندا

بێهوودە نییە."



## دێڕی دووەم

**لەو کاتەوەی کە منیان لە نەیستان بڕیوە و دابڕیوە**

**ژن و پیاو بەهۆی شیوەنم ناڵەیان دونیای تەنیوە**

هەموومان لە دەروونی خۆماندا ئارەزوویەکمان بۆ دۆزینەوەی ئامانج لە ژیاندا هەیە. هەر ئەزموونێک لە ژیاندا بەسەر دەبەین، ئێمە بەرەو پەیداکردنی ئامانجەکەمان ئاراستە دەکات. هێندێک جار ئەزموونی ئاڵۆزمان هەیە، هێندێک جار بەهۆی زۆری خەم و خەفەتەوە هەست بە خنکان دەکەین و لە ژیان بێزار دەبین. هەموو ئەم ئەزموونانە پەیامهێنەرن. بە گوێماندا دەچرپێنن و کە لەکوێ و چۆن دەتوانین ئامانجەکەمان بدۆزینەوە... لەبەر ئەوە زۆر گرنگە بتوانین گوێ بۆ ئەزموونەکانمان ڕادێرین.

ئەو کەسانەی کە خۆیان بە داڵغە و خەمی دونیاوە گری دەدەن، واتا هەمان ئەو کەسانەی لە هەوڵدان پێ بە پێی ئەو خێراییەی سەدەی تازە هەیەتی، بجووڵێن کە دەبێتە هۆی ئەوەی لە خۆیشیان دوا بکەون یان تەنانەت لە خۆیشیان بێگانە ببن، ئەم ورتەورتانەی ناو دڵی ئەزموونەکان نابیستن. ئەگەریش بیبیستن، نایانەوێ گوێی بۆ ڕادێرن. چونکە لە خاوبوونەوە دەترسن... بۆ ئەوان خاوبوونەوە لە سەردەمی خێراییدا هەڕەشەیەکی کوشندەیە...

لە جیاتی ئەمە، ئەو ورتەورتانە سەرکوت دەکەن... لەبەرچاوی ناگرن و نایبیستن.

هەر کارێکت دەوێ بیکە؛ ئەو ورتەورتە ئیلاهییانە هەرگیز لەنێو ناچن... هەر لەوێدا لە چاوەڕوانی ئەوەدا کە ببیسترێن، دەمێننەوە. هەمیشە بوونیان هەیە، لە ڕۆژێکدا کە بڕیارت دا خاو ببیتەوە و نیازی ئەوەت هەبوو گوێ بۆ ژیان ڕادێریت، یان لە نێوان دێڕەکانی کتێبێکدا، لە نێوان دەقی گۆرانییەکدا، لە بازاڕ یان هەر جێیەک، یان لە هاوڕێیەتی کەسێکدا، دێتە سەر ڕێگەت و خۆیت بەیاد دەهێنێتەوە...

مەولانا لە دێڕی دووەمی مەسنەویدا ئەوە بەیان دەکات کە شین و شەپۆڕی لقی نەی بۆ جیابوونەوەی کە بە ئاوازە غەمگینەکەی دەبێتە هۆی گریانی هەمووان، هەستی هاوبەشی نێوان مرۆڤ و ئەوە.

زوبان، دین، ڕەنگی پێست، نەژاد، تەمەن، کەلتوور و خوێندەواری هەر چۆنێک بێت؛ ئەشکی مرۆڤەکان یەکسانە.

دەکرێت مرۆڤەکان بە زمانی جیاواز قسە بکەن، خاوەنی کەلتوور و باوەڕی جۆراوجۆر بن، دۆخی ماددی و ژیانی جیا لە یەکیان هەبێت، شادی و سەرگەرمیی تایبەت بە خۆیان هەبێت، جەژن و بۆنەی هەمەچەشنیان هەبێت، بەڵام فرمێسکەکانیان هەمیشە یەکسانە و هەمیشە بە هۆکاری هاوشێوە دادەبارێن.

هەستی مرۆڤەکان یەکسانە.

هەرچەندێکیش ژیانی جودا لە یەکمان هەبێت، ناتوانین بە بوونی هەستە هاوبەشەکانمان لەیەک دوور بکەوینەوە و جیا ببینەوە.

گریان زۆر بەهادارە، ئینسانییە، حەقیقەتە...

شاعیرێک دەڵێت: **"گریان چاوی پێکەنینی ڕۆحە."** ڕۆح وەک چەترێک مرۆڤەکان لەژێر خۆیدا لە شوێنێکدا کۆ دەکاتەوە.

بارودۆخ و کەلتوورەکانمان هەرچەندە جیاواز بن، هەستەکانمان یەکسانن. گریان هەموومان ئارام دەکاتەوە. شۆردنی ڕۆح و خاوێنکردنەوە و نوێکردنەوەیەتی.

ئارامگرتن و شایستەبوون بۆ ئەوەیە لە ناخی دڵەوە پێبکە نین .

هەستی پێکەنینیش هەستێکی هاوبەشی نێوان مرۆڤەکانە.

مرۆڤایەتی پێکەنین و گریان بە باشی دەناسێت... ئەم بابەتە لە تەواوی دونیادا بەم جۆرەیە. ڕاستییەکە هیچ کەس توانای گۆڕینی نییە.



فرمێسکیش ئەرکێکی
تایبەت بە خۆی هەیە.
بەهۆی ئەو پێکەنینەی
لە دوایەوە دێت،
هەموو شوێنێک
خاوێن دەکاتەوە.



# دێڕی سێهەم

**سینەیەکم دەوێ شەقار شەقار لە تاو فیراق**

**تاکوو بیلێم شەرحی دەردی ئیشتیاق**

نابێت بیرمان بچێتەوە کە نەی مرۆڤ هەڵدەبژێرێت...

چونکە مرۆڤیش مرۆڤ هەڵدەبژێرێت...

مەولانا بە وتنی "لای هاورێکان جودایی باش نییە / بێ ڕۆشنایی باش نییە" پێویستیی بەیەکگەیشتنی مرۆڤەکانمان بۆ ئاشکرا دەکات.

بۆ هاوڕێیەتی هاوڕێ هەڵدەبژێری.

بۆ هاوسەری هاوسەر هەڵدەبژێری.

بۆ دراوسێیەتی دراوسێ هەڵدەبژێری.

بۆ دەردی خۆت هاودەرد هەڵدەبژێری.

بۆ ڕێگەی خۆت ڕێوان هەڵدەبژێری.

بۆ دڵی خۆت دۆستێکی هاودڵ هەڵدەبژێری.

نەی دەی، سەرەڕای هەموو ئەمانە بۆچی لە مەسنەویدا نەی شیوەن دەکات کە "سینەیەکم دەوێ شەقار شەقار لە تاو فیراق، تاکوو بیڵێم شەرحی دەردی ئیشتیاق"؟

لە ڕاستیدا دەیەوێ چی بڵێت؟

شیوەن و هاواری ئەو لەبەر چییە؟ بۆ کێیە؟

بەدڵنیاییەوە کەسێکی دەردمەند لە دەردی ئەوی تر تێدەگات و عاشقیش دەتوانێت لە حاڵی عاشقێکی تر تێبگات.

بۆ کەسێک کە نەسووتاوە، چۆن دەتوانی باسی ئاگر بکەیت؟

بۆ کەسێک کە لە ژیانی خۆیدا زەریای نەبینیوە، چۆن دەتوانی باسی نقووم بوونی بۆ بکەیت؟

سۆفییەک وتوویەتی: **"ئایا کەسێک کە قسەی عاشقەکان دەبیستێت و دووبارەیان دەکاتەوە، عاشقە؟**

**ئەو تەنها باس لە دیواری کۆشکێک دەکات کە ناوەوەی نەبینیوە."**

وەک ڕووبەڕوو بوونەوەی شاعیرانێکە کە عاشق نەبوون، بەڵام لەبارەی عیشقەوە دەنووسن. پرسیارەکە ئەوەیە "ئایا دەتوانرێت بە کەسێک کە لەملا و لەولا باسی عیشق دەکات، بوترێت عاشق؟" بۆ دەربڕینی ئەندازەی بێگانەیی ئەو لەگەڵ عیشقدا دەبێت بڵێین: "دۆخی ئەو کەسە بە جۆرێکە کە ناوەوەی کۆشکێکی نەبینیبێت، بەڵام باس لە دیوار و حەسارەکانی چواردەوری بکات." بێگومان تەنها عاشقێکی ڕاستەقینە دەتوانێت لە عیشق تێبگات.

لە مەولانایان پرسی: "عیشق چییە؟" ئەویش لە وەڵامدا وتی: "وەرە ببە بە من یان هاوخووی من / تا ببینی لە درەوشانەوەدا ڕووی من."

ئەییش دەردەدارە. هەزار پارچەیە؛ کتومت وەک مرۆڤێک کە لە دونیا دابڕاوە و نازانێت دەبێ چی بکات...

هەمیشە بەو ئەزموونانەی کە ئەو تاقی دەکەنەوە تا ڕێگەی خۆی بدۆزێتەوە، لەم هەزار پارچە بوونەی خۆیدا ڕەنج دەکێشێت. تەنها دەتوانێ لەگەڵ ئەوانەی کە بارودۆخی هاوشێوەی ئەویان هەیە، دەردەدڵ بکات. تا ئەو کاتەی بۆی دەردەکەوێت کە ئازار گەشەی پێ دەدات، وای بە باش دەزانێت پەنا بۆ کەسێک بەرێت کە بە ئازاری خۆی توانیویەتی هەلومەرجی پێشکەوتنی خۆی فەراهەم بکات.

هەڵبەتە نەی ئەوەیش بەیان دەکات کە نابێت لە عیشق هەڵبێت... لە عیشق ڕامەکە تا ڕازەکانی عیشقت بۆ ئاشکرا دەبن...

"عیشق هەبێت" ڕستەیەکە سۆفییەکان بە یەکتری دەڵێن.

هەرچەندە ئەمڕۆکە ئەم ڕستەیە بۆ دەربڕینی ڕەنجانیش بەکار دێت. سۆفییەکان بۆ یەکتر داوای عیشق دەکەن. دەڵێن "با لە ژیانتدا عیشق هەبێت." بە تێپەڕینی کات ئەم ڕستەیە کورت بوویەوە و بوو بە "عیشق هەبێت"...

ئەحمەد قوددوسی دەڵێت: **"عیشق بکەرە تاجێک لەسەر سەری خۆت و مەڵێ مەجازییە. هەڵبەتە عیرفانیش دەچێتە ناو دڵی کەسێکەوە کە عیشقی تێدا بێت..."**

واتا ئەگەر عیشق مەجازییش بێت و عیشقی دونیاییش بێت، دیسان هەبوونی تروسکەیەکی عیشقە لە دڵدا. چونکە عیرفان دوای ئەوە دەچێتە ناو دڵەوە.

دەی، بۆچی لە جیاتی وشەی "زانست" وشەی عیرفانیان هەڵبژاردووە؟

چونکە زانست بەواتای زانینی شتێکە، بەڵام عیرفان ئەزموونی ئەو شتەیە کە دەیزانی.

ئەمەیش بەو واتایەیە کە ئەگەر زانیارییەکانت لە ژیانتدا نەکردووە بە کردار، کەواتا عاریف نیت. لەم ڕووە هۆشیاری بەهادارە، بەڵام گۆڕینی هۆشیاری بۆ حەقیقەت بەهادارترە.

هەربۆیە نیازی میسریی عاریف وەک سەرمەشق لەم ڕستەیەدا وشەی زاهید بەکار دەهێنێت: **"ئەی زاهید پێت وا نەبێت بە نوێژ و ڕۆژوو و حەج کارت تەواوە؛ بۆ بوون بە مرۆڤێکی کامڵ ئەوەی پێویستە عیرفانە..."** چونکە وشەی زاهید لەبارەی کەسێکەوەیە کە تەنها پەرستش دەکات و هیچ ئاگای لە کاروبارەکانی تر نییە.

"پێت وایە بە دەستشۆردن لە کاروباری دونیا و تەنها بە پەرستش کارت تەواوە؟ ئەگەر دەتەوێ کەسێکی پارێزکار بیت، پاشان بە کەماڵی ئینسانی بگەیت و لە ڕازەکان ئاگادار بیت، دەبێت ببیت بە عاریف."

ئەو کەسەی هۆشیاری و ئەزموونەکانی تاقیکردۆتەوە، بە عاریف لەقەڵەم دەدرێت.

ئایا مرۆڤێک کە عیشق، ژیان، گوناه، پەشیمانی، سەرکەوتن، ناوان، ئەزموون، ڕێگە، جەفا و مشتومڕ دەزانێت و ئەمانەی ئەزموون کردووە، لەگەڵ کەسێک کە ئەمانەی تەنها بیستووە، خوێندۆتەوە یان بەر چیرۆکەکانی کەوتووە، وەک یەک وایە؟

بە شێوەیەکی گشتی لە دێڕی سێهەمی مەسنەویدا هاواری ئەو نەیەی کە سیمبولی مرۆڤە، پێمان دەڵێت بۆ ئەوەی ببینە کەسێکی تێگەیشتوو دەبێت لەگەڵ خاوەنی عیرفاندا دیدار بکەیت. چونکە تەنها یەک عاریف دەتوانێت گوێت بۆ ڕادێرێت. ئەوانی تر تەنها دەتبیستن. بەڵام ناتوانن لە ڕازەکانی تێبگەن.



"ئەو دڵەی
کە عیشقی تێدا نییە
یان هیی شێتەکانە
یان مردووەکان..."



# دێڕی چوارەم

**هەر کەس دوورکەوتەوە لە ئەسڵی خۆی**

**هەر دەگەڕێت لە دووی ڕۆژانی وەسڵی خۆی**

هەموو شتێک لە ڕاستیدا بەدوای گەڕانەوەوەیە...

نەی کە سیمبوڵی مرۆڤە لە مەسنەویدا، بەهۆی جودابییەوە لە نەیزار لە هەوڵی گەڕانەوەدایە بۆ شوێنی خۆی و شیوەنی لەبەر ئەمەیە.

لەم بەشەدا لە ڕووی فەلسەفەی تەسەوفەوە لە نێوان سۆفییەکاندا یەکێتیی بوون و باوەڕی یەکتاپەرستیی بوونی هەیە کە باشترە کەمێک لەسەری ڕابوەستین (بیر بکەینەوە). لەسەر بنەمای ئەم باوەڕە، هەموومان بەشێکین لە بەدیهێنەر. ئەگەرچی ڕەنگە وا بێتە بەرچاو کە بە هاتنە نێو ئەم دونیایەوە لە بەدیهێنەر جیا بووینەتەوە، بەدڵنیاییەوە گەڕانەوەمان بۆ لای ئەو دەبێت.

هەر ئەزموونێکمان لە دونیادا لەگەڵ ئارەزووی دیداری ئەودا گرێدراوە و لەم ڕێیەدا شیوەن و هاواریشمان لەبەر پێویستیی گەیشتن بەو و گەڕانەوەیە بۆ بنەڕەتی خۆمان.

ئەگەر ئێمە دڵۆپە ئاوێک بین، بەدیهێنەر ئۆقیانووسە.

دڵۆپە ئاو بە تەنیا هیچە. لەژێر کاریگەریی کەمێک گەرمیدا دەبێت بە هەڵم، نە ژیان دەبەخشێت نە خۆی زیندوو دەمێنێتەوە... لە لاوازی و بێتوانایییدایە. ئێستا ئەگەر بە ئۆقیانووسەوە پەیوەست بێت، خۆیشی دەبێت بە ئۆقیانووس. ئەوسا نە دەبێت بە هەڵم و نە زیان دەبینێت. لە هیچەوە دەبێت بە هەموو شتێک.

سۆفییەکان بەم دۆخە دەڵێن "فنا فی اللە" یان "بک یا اللە". واتا توانەوەی بوونی خۆت لە بوونی بەدیهێنەردا... وەک گەیشتنی دڵۆپەیەک ئاو بە ئۆقیانووس و یەکبوون لە گەڵیدا...

بایەزیدی بەستامی چیرۆکێکی هەیە کە لە کۆنەوە سینە بە سینە دەوترێتەوە:

ڕۆژێک لە دەرگای ماڵی بایەزیدی بەستامی دەدرێت... یەکسەر دەرگاکە دەکاتەوە. لەو کەسەی بەرانبەری ڕاوەستاوە دەپرسێت: "کارت بە کێ هەیە؟"

پیاوەکە وەڵام دەداتەوە: "بایەزید."

بایەزید پێی دەڵێت: "کەواتا درێژە بە ڕێگەکەت بدە، چونکە جگە لە خودا کەس لەم ماڵەدا نییە."

هێندێک لە سۆفییەکان لەم سیستەمی بیرکردنەوەیەدا

زیادەڕۆیی زۆر دەکەن و بە شێوەی "انا الحق" بە واتای "من خودام" دەریدەبڕن. بە باوەڕی زۆرینەی زانایانی مسوڵمان ئەم وتەیە ڕێک کوفرە.

هەڵبەتە مەنسوری حەللاجیش کە هەر لەبەر ئەمە کوژرا، چونکە لەم بیرکردنەوەیەدا کە مرۆڤ بەشێکە لە خودا، زیادەڕۆیی زۆری کرد و پەرگیرانە دەدوا.

> تۆیان بەم باشی و جوانییەوە بینی و لە ترسان نەیانوت
> لە نوری خودایت و دیسان بە مرۆڤ بانگیان کردیت.

سۆفیی گەورەی ئازەربایجان "عیمادەددین نەسیم"یش هەر بەهۆی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەوە ژیانی لەدەست دا.

قسەکردن لەبارەی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەوە کە ئەم ڕۆژانە بەناوی "یەکێتیی بوون" باسی دەکرێت، لەو سەردەمەدا بەهۆی پەرگیریی زۆرەوە لەم باوەڕەدا، بوو بووە هەڕەشەیەک لەسەر ژیانی خاوەنەکەی.



لە ڕۆژی مەرگدا کاتێک تابووتی من هەڵدەگرن و دەیبەن،[1] پێت وا نەبێت کە من دەردی ئەم جیهانەم.
بۆ من مەگری و مەڵێ حەیف و جەخار. حەیف و جەخار ئەوەیە بکەویتە داوی دێو و درنجەوە.
کاتێک تەرمەکەم دەبینی مەڵێ جودایی جودایی.
ئەو ساتە دەمی گەیشتن و دیداری منە.



---

١- وەرە گەر من منم خوێنم بڕێژن        کە تا خودی من نەمرد لەدایك نەبووم.

غەزەلی ژمارە ١٥٠١ دیوانی شەمس

## دێڕی پێنجەم

**من لە نێو هەر کۆمەڵێکدا نالان بووم**

**هاوڕێی بەدحاڵان و خۆشحاڵان بووم**

جیاکارییەک لە سیستەمی بیرکردنەوەی مەولانادا بوونی نییە. ئەستەمە هێندێک لە مرۆڤەکان بەرزتر و هێندێک نزمتر یان لە ئاستێکی خوارتردا ببینێت. تەنها دەکرێت لە زەین، نەفس، ئیگۆ یان منگەراییەکی کۆنترۆڵ نەکراودا بەم جیاکارییە ڕازی بێت. ئەو جیاکارییانەی مرۆڤ بۆ بەرژەوەندیخوازییەکانی خۆی بەدییان دەهێنێت، قەبووڵکراو نیین. هیچ کەس ناتوانێت بەهۆی ئەو شتانەوەی هەیەتی لەوی تر باشتر بێت؛ لە بەرانبەردا کەسێکیش بەهۆی نەبوونییەکانییەوە لەوی تر نزمتر بێت.

پێشڕەویی مرۆڤ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەوەوە هەیە کە نەکەوێتە نێو داوی ئەم جیاکارییانەوە. کەس ناتوانێت بزانێت دەرمانی دەردی ئەو لەکوێ و بە دەستی چ کەسێک بەو دەگات. **سیستەمی خودایی دەردێک نانێرێت کە دەرمانەکەی لە دڵی خۆیدا نەبێت.**

ناتوانین بە زەینی خۆمان بیسەلمێنین کام پرس، کام گەڕان و کام لەو ڕێگەچارانەی بۆ ئامانجەکانمان پێویستن، لەکوێدا شاردراونەتەوە. سەرئەنجام دونیا دونیای فراوانییەکانە. سیستەمی خودایی باش دەزانێت چارەسەر چۆن و لەکوێدا بشارێتەوە. چونکە تەواوی ئەم پرۆسەیە لە ڕێگەی ژیاندایە. دەبێت ئەم هۆشیارییەت هەبێت کە لە ڕێگەی ڕەسایی ئینسانیدا، بەبێ قەبوڵکردنی جیاکاری و لەوپەڕی خاکەڕاییدا، دەکرێت سرووش یان هۆشیارییەک کە پێویستت پێیەتی، لەو شوێنەوە کە هەر بۆی ناچیت، بە تۆ بگات.

دەکرێت ئەو سرووشەی لە ژیانتدا بەدوایەوە بووی، لەو کەسەوە وەربگریت کە بۆ سڵاوکردن لێی خاکەڕایانە دەستپێشخەری ناکەی. ئێستا دەکرێت ئیگۆ یان خۆبەزلزانینی تۆ، ببێتە هۆی پشتگوێخستن و کارێک بکات لە ڕێگەی ژیاندا لەرزۆکانە بچیتە پێشەوە.

دەکرێت کەسێک بەهۆی دین، زوبان یان کەلتوورییەوە لەو دوور دەکەوتیتەوە یان گوێیەکانت لە هەمبەر قسەکانیدا دەگرت، وەک کەسێک لە بەرانبەرتدا بوەستێت کە ببێتە هۆی ئەوەی لە ڕێگەی پێگەیشتندا خێراتر بچیتە پێشەوە. کێ دەزانێ؟ مافی ئەوەت نییە بەرانبەر مرۆڤەکان خۆت بە زل بزانیت. هیچ کەسێک فیلتەر مەکە. تەنها لەبەر ئەو بیانووەی کە چوارچێوەی ئەوانی تر وەک چوارچێوەی تۆ نییە، کەس نادیدە مەگرە؛ چونکە هیچ کەس بەڕێکەوت ڕووبەڕووی تۆ نابێتەوە. کەوتنی گەڵایەکیش لە سیستەمی ئیلاهیدا ئەژماری بۆ کراوە. ئەستەمە ژیانی تۆ لە دەرەوەی ئەم سیستەمە بێت. ئاگات لەم بابەتە بێت کە هەر ساتێک لەژێر چاودێریی

سیستەمی ئیلاهیدایت. بزانە کە پێشوازیکردن یان نەکردنی تۆ لە ڕووداوەکان لە پێگەیشتنی تۆدا کاریگەریی ئەرێنی یان نەرێنی دەبێت.

**بگەڕێوە بگەڕێوە هەرچییەک هەیت بگەڕێوە**

**گەر کافر و گاور و بتپەرستی بگەڕێوە**

**ئەم دەرگایەی ئێمە دەرگای نائومێدی نییە**

**سەد جار ئەگەر تەوبەت شکاند بگەڕێوە**

لەگەڵ ئەوەی بە شێوەی جیاواز فووم کردووە بە نەیدا (هێندێک جار بە ئاوازی هیندی، هێندێک جار لە مۆسیقای ئەلیکترۆنیدا، هێندێک جار لە مۆسیقای ڕاپدا) یان لەو بانگهێشتانەدا کە بۆ دامەزراندنی پەرستگەکان دەکرام، نەیم ژەنیوە. هێشتاکەیش کەسانێکی زۆر ڕەخنەم لێ دەگرن.

ئێستا من بە چ مافێک دین، زمان، کەلتوور یان شێوازی ژیانی ئەو سەرزەنشت بکەم و خۆمی لێ بەدوور بگرم؟ کاتێک لەبارەی یەکێتیی بوون لە کائینات و ئەوەی کە مرۆڤ لە کۆتاییدا بەرەو لای بەدیهێنەری خۆی دەگەڕێتەوە، قسە دەکەم، بۆچی دەبێت لە نێوان مرۆڤەکاندا جیاکاری بکەم؟

ئەگەر ئەو کەسەی ڕەخنە لە من دەگرێت لەبارەی هەژدە دێڕی سەرەتای مەسنەوییەوە زانیارییەکی کەمی هەبێت و بڕێک لەبارەی ئەم دێڕەوە "من لە نێو هەر کۆمەڵێکدا ناڵان بووم" بیری کردبێتەوە، دەتوانێت لەوە تێبگات کەس مافی سەرزەنشتکردنی مرۆڤەکانی تری نییەز

ئەم فەلسەفەیەی تەسەوف کە "نابێت جیاکاری لە نێوان مرۆڤەکاندا بکرێت." هزر و تێزێکە دونیای ئەمڕۆ زۆر پێویستی پێیەتی.

مەولانا هیچکات مرۆڤێک لە مرۆڤێکی تر جیا ناکاتەوە، بەڵکوو هەمیشە هەموویان وەک یەک سەیر دەکات.



بۆ دۆزینەوەی کەموکورتی
سەیری کەس مەکە؛
چونکە بەدوایدا دەگەڕێیت،
دەیدۆزیتەوە. فێری هونەری
داپۆشینی کەموکورتییەکان بە.
ئەوسا بێ کەموکورتی دەبیت."



## دێڕی شەشەم

**هەر کەس بە گومانی خۆی بوو بە یاری من**

**بێ ئەوەی لە ناخمدا بگەڕێ بۆ ئەسراری من**

ئەو نەیەی لە مەسنەویدا سیمبوڵی مرۆڤە، لە دێڕی شەشەمدا بەهۆی ئەوەی کە دەیبیستن و لێی تێناگەن، شیوەن و هاوار بەرێ دەخات.

دەڵێت هەر کەسێک لەو نزیک بوویەوە دەرگای هاوڕێیەتی کردەوە، بەڵام کەس نەیتوانی لێی تێبگات و بە زمانی حاڵ دەڵێت کە هیچ کەس مەبەستی ئەو لەوەی کە دەیڵێت یان ئەنجامی دەدات، تێناگات.

ڕەنگە لەبارەی نەیەوە وتبێتیان "چ ئاوازێکی خۆشی هەیە" و بە تەنیشتیدا تێپەڕیبن. لەگەڵ ئەوەی دەردی نەی لە پشت ئەو ئاوازە خۆشەوەیە.

مەگەر دەتوانی کاتێک لە دەنگ، بوون و نیازی دروستکردنی ئەو ئاگادار نیت، ناوی ئەم پەیوەندییە بنێیت هاوڕێیەتی؟

"تێگەیشتن لە حەقیقەتی شتەکان" چەمکێکە سۆفییەکان زۆر جەختی لەسەر دەکەنەوە و لەبارەیەوە بیر دەکەنەوە و باسوخواس ئەنجام دەدەن. واتا نابێت ڕواڵەتی شتێک بە وەک حەقیقەتی ئەو شتە لە قەڵەم بدەی. هەر شت و هەر کەسێک حەقیقەتی زاتیی خۆی هەیە.

واتا دەکرێت تەنانەت بە سەیرکردنی گەڵایەک بە ئەفرینەر بگەین.

کەسانێک هەن بە بینینی گەڵایەک دەڵێن: "دەی مەگەر چییە، گەڵایەکی سادەیە کە لە لقی درەختێک بەربۆتەوە، گەڵایەک کە چارەنووسی هەر زەرد بوون، وشک بوون و کەوتنەخوارەوەیە." بەڵام بەدڵنیاییەوە هاوشانی ئەم جۆرە مرۆڤانە، کەسانێکی تریش هەن کە بە بینینی ئەو گەڵایە بە خودا گەیشتبن. تەنها هێندە بەسە کە دەروونی خۆیان ڕاهێنابێت و فێر کردبێت.

بە شێوەیەکی گشتی سەیرکردن و ڕوانین جیاوازن...

خۆریش وا دێتە بەرچاو هەموو ئێوارەیەک ئاوا دەبێت، بەڵام ئەوە زەوییە کە دەسووڕێتەوە، خۆر هەڵاتن و ئاوابوونی نییە.

بینینی پشتی پەردەی بابەتەکان، سیستەمێکە بەهۆی هەوڵدانەوە بەدەست دێت و سۆفییەکان بەمە دەڵێن: "بینینی ڕووداوەکان بە سپێنەی چاو لە جیاتی گلێنەی چاو."

ئەوەی بە گلێنەی چاو دەبینرێت ڕەنگدانەوەیەکە، فریودانێکە، کەموکورتییەکە، گومڕاییەکە کە دەبێتە هۆی کوێری... بەڵام ڕوانین بە سپێنەی چاو بینینی پشتی پەردەی ڕواڵەتی ڕووداوەکانە، ئەوەی دەبینرێت حەقیقەتە، زوڵاڵە، زاتە...



بارانێکیش هەیە کە باران تەڕ دەکات!

ناوی عیشقە.

ئاگرێکیش هەیە کە ئاگر دەسووتێنێت!

ناوی عیشقە.

ئەوەی دەبێتە هۆی سووتانی پەپوولە و خزانی ئەستێرەکان، عیشقە... عیشق دۆخێکە سێبەرەکان دەخاتە ژێر سایەوە. هەلومەرجێکە ڕازێکی دووبارە بە نهێنییەکان دەدات و عیشقێک بوونی هەیە کە خودی عیشقیش عاشقی ئەو دەبێت، ئەویش عیشقی خوداییە...'





**ئەگەر تریفەی مانگ**

**بەر ڕووخسارت ناکەوێ،**

**ئەگەر خۆر بەسەر پەنجەرەکەتدا**

**نادرەوشێتەوە،**

**ڕەخنە لە مانگ و خۆر مەگرە.**

**پەردەی سەر چاوەکانت لادە."[1]**



---

١- بە ئەندازەی کلاوەڕۆژنە تریفەی مانگ دێتە ماڵەکەتەوە
ئەگەر ڕووناکییەکەی ڕۆژهەلات و ڕۆژ ئاوایش بگرێتەوە

غەزەلی ژمارە ٩٣٩ دیوانی شەمس

# دێڕی حەوتەم

**را نەزانی ڕازی من لە ناڵەناڵم بەدوورە**

**بەلام چاو و گوێ بێبەشن لەو نوورە**

پەیڕەوانی مەولانا بە نەی دەڵێن "هەڵگری ڕازەکان". زاراوەی هەڵگری ڕازەکان سەدان ساڵە بەشێوەی چیرۆک سینە بە سینە دەگوازرێتەوە.

بۆ یەکەم جار ئەم چیرۆکە لە کتێبەکەی فەریدەدین عەتاردا هاتووە... پاشان لە سەرچاوەکانی تریشدا گێڕدراوەتەوە.

حەزرەتی موحەمەد (دروودی خوای لەسەر بێت) لە دوای شەوی میعراج، کە بە باڵاترین ئاستی پێگەیشتنی مرۆڤێک گەیشتبوو، لە ڕازی زۆر ئاگادار بوو.

ڕۆژێکیان کاتێک لەبارەی ئەم ڕازانەوە سەرقاڵی بیرکردنەوە بوو، حەزرەتی عەلی (سڵاوی خوای لەسەر بێت) دێت بۆ لای و دەپرسێت: "سەروەرم دەبینم زۆر لە بیرکردنەوەدا ڕۆچوویت، ئایا کێشەیەک هاتۆتە پێش؟"

حەزرەتی موحەمەد (دروودی خوای لەسەر بێت) وەڵام دەداتەوە: "نا، کێشەیەک نییە. خەریکم بیر لەو ڕاز و نهێنییانە دەکەمەوە کە لێیان ئاگادار بووم."

حەزرەتی عەلی (سڵاوی خوای لەسەر بێت) بە بیستنی ئەم وەڵامە زۆر دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە.

دەپرسێت: "ئایا دەکرێت هێندێک لەو ڕازانە بە منیش بڵێیت؟"

حەزرەتی موحەمەد (دروودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: "ناتوانی بەرگەیان بگریت، ئەی عەلی."

بەڵام کاتێک بریسکەی نێو چاوەکانی حەزرەتی عەلی (سڵاوی خوای لەسەر بێت) دەبینێت، ئاماژەی بۆ دەکات لە تەنیشتییەوە دانیشێت، پاشان دەست بە باسکردنی ڕازەکان دەکات.

حەزرەتی عەلی (سڵاوی خوای لەسەر بێت) دوای بیستنی وتەکانی پەیامبەر، هەست بە جۆشوخرۆشێکی بەهێز لە دەروونیدا دەکات. ئیتر ناتوانێ لە جێگەی خۆی دانیشێت. مۆڵەت لە حەزرەتی محەمەد (دروودی خوای لەسەر بێت) وەردەگرێت تا بڕواتە دەرەوە. دڵی بە ئەندازەیەک قورس دەبێت کە دەیەوێت هاوار بکات. حەز دەکات کۆڵان بە کۆڵانی شاری مەککە بگەڕێت و ئەو ڕازانەی وەک بارێک بە گیان هەڵیگرتوون، بە گوێی هەموو کەسێک بگەیەنێت. تەنها بەو شێوەیە هەراوزەنای ناو دەروونی ئارام دەبوویەوە، بەڵام نەیدەتوانی ئەم کارە بکات.

ناوی خۆیان بە خۆیانەوەیە، ئەو شتانەی وەک بارێک هەڵیگرتن، ناویان 'ڕاز'ە. بۆ ئاشکراکردن نابن، بەرپرسیارێتییان هەیە.

دەی، ئێستا دەبێت لەگەڵ ئەم سێلاوە خرۆشاوەی دەروونی چی بکات؟

لەکوێ دەتوانێ باری سەر دڵی دابگرێت؟

لەم بیرکردنەوانەدا بوو کە بیرۆکەیەک بە سەریدا دێت؛ لە مەککە دەچێتە دەرەوە و بیرێکی وشک دەدۆزێتەوە. نهێنییەکانی نێو دڵی بە هاوار بە بیرەکە دەڵێت. پاشان هەستی ئارامی دڵی دەگرێتە خۆی.

بەڵام ئەو نهێنییانەی لەژێر باریاندا ڕزگار بووبوو، ئەم جارە بیرە وشکەکە دەخەنە ژێر کاریگەرییەوە. دوای بیستنی ڕازەکان بیرەکە دەنگی لێ بەرز دەبێتەوە، وەک بڵێی لە باری خرۆشاندا بێت. لە تاوان پڕ دەبێت لە ئاو. ئاو هەروا بەرز و بەرزتر دەبێتەوە. هێندەی پێ ناچێت کە ئاوی ناو بیرەکە سەرڕێژ دەبێت. تا ئەو جێیەی کە نەیزارەکانی چواردەوریشی تێراو دەکات.

بەم شێوەیە ئەو ڕازانەی بیرەکە هەڵیگرتبوون بۆ نەیزارەکەیش دەگوازرێنەوە. بیرەکە ئارام دەبێتەوە، بەڵام ئەم جارە ڕازە ئاسمانییەکان دەکەونە گیانی لقەکانی نەی.

ڕۆژێکی بەهاری شوانێک کە لەگەڵ مەڕەکانیدا بە تەنیشت بیرەکەدا تێدەپەڕێ، بۆی دەردەکەوێت کاتێک با بەر لقی نەیەکان دەکەوێت، ئاوازێکی خۆش دەردەکات. یەکسەر لقێک نەی لێ دەکاتەوە و . بۆ ماوەیەک لای خۆی دەیهێڵێتەوە تا وشک بێتەوە. لەسەر قەدەکەی چەند کونێک دروست دەکات و فووی پیدا دەکات.

رۆژێکیان کاتێک حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت) لەگەڵ حەزرەتی عەلی (سڵاوی خوای لەسەر بێت) لە شار خەریکی گەڕان بوون، گوێیان لە دەنگی ژەنینی قەراغی نەی دەبێت لە لایەن شوانەکەوە. حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت) بۆ تاوێک ڕادەوەستێت و ڕوو لە حەزرەتی عەلی (سڵاوی خوای لەسەر بێت) دەپرسێت: "عەلی، تۆ نهێنییەکانی منت لای کەسێک باس کرد؟"

حەزرەتی عەلی (سڵاوی خوای لەسەر بێت) هەوڵ دەدات دۆخەکەی بۆ ڕوون بکاتەوە کە چۆتە سەر بیرە وشکەکە و ڕازەکانی هێناوەتە سەر زمان.

حەزرەتی محەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت) سەیری ئەو لایە دەکات کە ئاوازی نەیەکەی لێوە دێت و دەفەرموێت:

**"ئەم لقە نەیە تا ڕۆژی دوایی نهێنییەکانی من دەڵێتەوە، بەلام تەنها ئەو کەسانەی دڵیان کراوەتەوە لەم ڕازانە تێدەگەن."**

لەم ڕووەوە سۆفییەکان نەی "بە هەڵگری ڕازەکان" ناو دەبەن.

ڕازە خوداییەکان شاراوە یان داپۆشراو نیین. لە دوورەدەست یان ئەو شوێنە سەختانەیشدا نیین کە دەست پێیان ناگات. لە نزیکی مرۆڤەوەن. ڕەنگە نیگایەک، دەستلێدانێک، یان مەودای هەناسەدانێک بێت. لەوانەیە ئەوەندە نزیک بن کە دەستت درێژ بکەیت بتوانی بیانگریت، بەڵام بەدڵنیاییەوە لە دوورەدەست و شوێنە نەناسراوەکاندا نیین.

ڕاز ئەوە نییە کە دەستت پێی ڕانەگات یان نەناسراو بێت، بەڵکوو ئەوەیە کە تەنها لە چاوەڕوانیی ئاشکرا کردندا بێت...

ڕاز دیاردەیەک نییە کە پێویست بێت بە دوایدا بگەڕێی، یان هەوڵی بەدەستهێنانی بدەیت، بەڵکوو پێویستە لێی تێبگەیت.

مرۆڤ لە هەمبەر سیستەمی ئیلاهی دووچاری هەڵەیەک بووە. یان پێی وایە کەسێک دەبێت فێری بکات، یان وا دەزانێت لە شوێنێکدا شاردراوەتەوە و تەنها کەسانێکی تایبەت دەتوانن دەستیان پێی بگات. بەڵام ڕاز لە سەردایە. ڕەنگە لە شادەمارت نزیکتر بێ لێتەوە، ڕەنگە لەو هەوایەدا بێت کە هەڵی دەمژی، یان لەو ئاوەدا کە دەیخۆیتەوە، هەرچییەک بێت، بەدڵنیاییەوە لە دەوروبەری تۆیە. هێندە بەسە چاو و دڵی مرۆڤ کراوە بێت... هێندە بەسە بۆ بیستنی گوێی دڵت ئامادە و پاکژ بێت... تا لە جیاتی بیستن، گوێی بۆ ڕادێرێت... لە جیاتی هەوڵدان بۆ بینینی، لێی تێبگات. لە جیاتی ڕاکردن بە دوایدا، بتوانێت هێواش بێتەوە.



ئەوەی دەیبینی تۆ لە دڵدا بۆ بگەڕێ، نەک لە ئاوێنەدا
ئاوێنە دەبێتە نەخش، بەڵام ناتوانێت ببێتە گیان



# دێڕی هەشتەم

**جەستە لە گیان و گیان لە جەستە شاراوە نییە**

**بەڵام کەس لەبارەی ڕۆحەوە شارەزا نییە**

هەناسە گیانە...

واتا هەناسەی بەدیهێنەر کراوەتە بەر گیانی مرۆڤ.

ڕۆح هیی خودایە و خودا جەستەی لە گڵ دروست کردووە...

بۆ دۆزینەوەی هەناسەی بەدیهێنەر تێیدا، حوکمی جەستە کەنار گرتنە. هەر بەو جۆرەی یونس ئیمرە وتوویەتی:

**"ئەگەر لە نێواندا لاچیت، ئەفرێنەری تۆ دەمێنێتەوە."**

ئەو مرۆڤەی تەرکیزی هەر لەسەر جەستەی خۆی بێت، تەندروستی و ناتەندروستی لەسەر جەستە هەڵدەسەنگێنێت، لە کاتێکدا تەندروستی و بوون لە ڕۆح و دەرووندایە.

هەر لەبەر ئەوەیە کە سۆفییەکان گرنگییەکی زۆر بە ڕاهێنانە دەروونییەکان دەدەن. ئەم ڕاهێنانانە تەنها لەبەر ئەوە نیین کە بتوانن نۆتەی جوان لە نەی دروست بکەن. بەم جۆرە ڕاهێنانانە ڕێگەی دۆزینەوەی ڕۆحی خودا لە ناخی خۆیاندا ئاشکرا دەکەن و پەرەی پێ دەدەن.

بایەزیدی بەستامی چیرۆکێکی بەناوبانگی لەم بارەیەوە هەیە:

ڕۆژێکیان بایەزیدی بەستامی خەریکی وانە وتنەوە بە قوتابییەکانی بوو، کوێخای گوندەکە هات بۆ لایان و بە حاڵەتێکی تانەئامێزەوە پرسی: "ئێوە ئەمساڵ بۆ حەج ناڕۆن؟"

کەس وەڵام ناداتەوە.

کوێخا بە بینینی ئەم دۆخە لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێت و دەڵێت:

"ئەمساڵ پێنجەم جارمە دەڕۆم بۆ حەج."

ئەو لە ڕەفتاری خۆیدا فەزڵی خۆی بەوان پیشان دەدات و لە ڕووی گاڵتەجاڕییەوە دەڵێت:

"هیچتان لەوێ ناوێ؟"

بایەزیدی بەستامی لێی دەپرسێت: "بۆچی دەڕۆی بۆ حەج؟ ئەگەر حەوت جار بە دەوری منیشدا بسووڕێیتەوە هەر وەک ئەوە وایە چووبیت بۆ حەج!"

بە بیستنی ئەم قسەیە کوێخا زۆر تووڕە دەبێت، هەروا کە دەنگی بەرز دەکاتەوە دەڵێت: "بەڕێز.. بەڕێز.. تۆ دەزانی چی دەڵێیت؟ ئەم قسەیەی تۆ کوفرە."

بایەزیدی بەستامی لەوپەڕی ئارامیدا وەڵامی دەداتەوە:

"لەو کاتەوەی ئەو بینایە دروست کراوە، خودا ڕەنگە یەک جاریش نەچووبێتە ناوی، بەڵام لە دڵی ئەم هەژارە داماوە تەنانەت بۆ ساتێکیش دەرنەچووە."

دۆزینەوەی خودا لە هەر ڕۆحێکدا بە گەیشتن بەو ئاگاییەی کە ئەو لە دەماری لا مل لە ئێمە نزیکترە، مرۆڤ لە داوی جەستەی، لە فەنا بوونی، ڕواڵەت و سنووردارییەکانی ڕزگار دەکات.

جەستە سنووردارە، بەڵام ڕۆح بێسنوورە.

جەستە نمایشکارە، بەڵام ڕۆح خاکییە.

جەستە ترسە، ڕۆح دڵنیاییە.

جەستە کۆتوبەندە، ڕۆح ئازادییە.

ڕۆح هەناسەی خوداییە کە کراوە بەبەر گیانی مرۆڤدا.



ئەی دڵ ئەگەر کەسێکیشت خۆش دەوێ،

ناوەوەیت خۆش بوێ نەک دەرەوەی.

ئەوەی بە چاو دەبینرێت، هەمووان خۆشیان دەوێت،

بەڵام تۆ دەبێ ئەوەت خۆش بوێ کە نابینرێت.

تۆ دەبێ خۆشت بوێ. تۆ بە قسە نا

دەبێ بە کردەوە بەدوای عیشقدا بگەڕێی و

لەم ڕێیەدا جەستە نا، گیانت بەخت بکەیت.



# دێڕی نۆهەم

**ئاگرە ئەم بانگی نەیە و پێت هەوا نەبێت**

**هەر کەس ئەم ئاگرەی نییە، با هەر نەبێت**

"کولان بە ئاگری عیشق" دەربڕینێکی زۆر گرنگە. ئەگەر باش لێی تێنەگەین، دەکرێت لە چوارچێوەی لەنێوبردنی کات و هەستەکان لە عیشقێکی یەکلایەنەدا لە زەیندا بمێنێتەوە.

لە حاڵێکدا کە لە بناغەی عیشقدا فیداکاری بوونی هەیە، عیشق بەردەوامبوونی باشی، جوانی، دروستیی، حەقیقەت، دادپەروەریی، بەشداربوون و قوربانیدانە لە پێناو موحیبەت و خۆشەویستیدا و هەوڵدان لەم ڕێیەدا دەبێت هەمیشە لەگەڵ ڕاستگۆییدا ئاوێزان بێت. ئایا بەڕاستی دەکرێت تەمەنی کەسێک کە بە درێژایی ژیانی هاوکاریی هیچ کەسێکی نەکردووە و سوودی بە کەس نەگەیاندووە، یان هیچ کات لەگەڵ خەمی ئەوانی تردا هەستی بە هاودڵی نەکردووە و بەشداری خۆشی و ناخۆشییان نەبووە، لە دڵی خۆیدا درێژەی بە عیشق نەداوە و هەرگیز هەوڵی ئەوەی نەداوە دوور لە شک و دوودڵی ژیانی خۆی بەرێتە پێشەوە، بە تەمەنێکی جوان لە قەڵەم بدرێت؟

بەسەربردنی ژیانی خۆپەرستانە دەبێت چ بەهایەکی هەبێت؟

ئایا دەکرێت بوترێت "زەحمەت"ی کێشاوە لە کاتێکدا دەستکەوتی بۆ هیچ کەسێک نەبووە و لە هیچ شتێکی تردا لەگەڵ ئەوانی تر هاوبەش نەبووە و چاکەی بۆ کەس نەبووە؟

بە شێوەیەکی گشتی زۆر بەهادارە کە بە ناوی عیشقەوە خۆت بۆ شتێکی جوان تەرخان بکەیت و لە پێناویدا دەست لە ئارامی و ئاسوودەیی خۆت هەڵگری و خۆبەخشانە لە ڕێگەیدا تێبکۆشی... مرۆڤ بە سووتان لەم ڕێیەدا دەتوانێت گەورە ببێت، بچێتە پێشەوە و بە پلەی مامۆستایەتی بگات.

ڕاستییەکەی ئەو زانایەی کە خۆی دەناسێت و خۆی بۆ ڕێگەیەک تەرخان دەکات و تیایدا سەرقاڵی خزمەتکردن دەبێت، ئەوە لەسەر ڕێگەی عیشق دەڕوات. ئەو هەوڵ و تێکۆشانەی لەم ڕێیەدا ئەنجامی دەدات و ئەو سەختی و دژوارییانەی بە گیان قەبوڵیان دەکات، ڕاستییەکەی سووتانە لە ڕێگەی عیشقدا، لەگەڵ ئەو جیاوازییەی کە هەرچی زیاتر بسووتێت زیاتر ئامادە دەبێت، زیاتر بە پێگەیشتن دەگات و دەبێتە مامۆستا.

ئەمە ئاگرێک نییە کەسێک بەهۆی دووری لە مەعشوقەکەیەوە دووچاری قەیرانێکی تاکەکەسی بکات، بەڵکوو ئەمە تەنها دەتوانێت هەستێک بێت کە بەهەڵە ناوی عیشقی لێ نراوە. ناتوانین ئەم چەمکە لە تەنیشت ئاگری ئەو عیشقە پیرۆزەوە کە مەولانا باسی دەکات، دابنێین.

**ئەگەر بە ڕۆح گوێ لە ئاوازی نەی بگریت، ئەم نەوایە دەبێت هۆی کڵپەسەندنی تۆ و پێگەیاندنت.**

ئاوازی نەی لە سەردەمی عوسمانیدا، لە نەخۆشخانەی گەوهەر نەسیبە، نەخۆشخانەی مانیسا، نەخۆشخانەی سوڵتان بایەزیدی دووەم کە ئەندازیار سینان دروستی کردبوو و لە زۆرێک لە نەخۆشخانە و ناوەندەکانی تەندروستیدا بۆ چارەسەری نەخۆشەکان بەکار دەهێنرا.

دەتوانن لە مۆزەخانەی شارستانییەتی سەلجووقییەکان لە کایسەری، سەردانی نەخۆشخانەکانی ئەو سەردەمە بکەن. ئەگەر سەیرێکی مێژوو بکەین، ئاگاداری کاریگەریی بەهێزی مۆسیقا لەسەر ساغڵەمی دەبین.

پزیشکانێکی زۆر لە کۆندا ماوەیەک سەرقاڵی ئەم بۆچوونەی مەولانا بوون کە ئاوازی نەی بە سووتاندنی دڵی مرۆڤەکان وەک ئاگرێکی چارەبەخش ناسێنراوە و لەو چارەسەرکردنانەدا کە بە مۆسیقا لە نەخۆشخانەکاندا ئەنجامیان دا، توانیان بینەری کاریگەرییە ئەرێنییەکانی ئەو بن.

ئەمڕۆکەیش لە بواری پزیشکیدا و تایبەت بە مۆسیقا سێراپی و یارمەتیدانی باشبوونی نەخۆشان بە ئاراستەی ئەرێنی کۆمەڵێک بەرەوپێشچوون ئەنجام دراوە و هەنگاوی باش نراوە.

خودی منیش بۆ ئەوەی لەم زەوینەیەدا بچمە پێشەوە، لە بەرنامەی "مۆسیقا بۆ تەندروستی – music for wellness" کە ناودارترین هونەرستانی مۆسیقای دونیا بە ناوی کۆلێجی مۆسیقای برۆکلی ئامادەی دەکاتو بەشداریم کرد.

هەم ویستم لەبارەی مۆسیقاوە، بڕوانامەی ئەکادیمیک بەدەست بهێنم و هەم ئاوازی نەی لە ئاستێکی بەرفراوانتردا بە گوێی مرۆڤەکان بگەیەنم؛ چونکە دەزانم ئاوازی نەی دەتوانێت مرۆڤەکان لە هەستێکی هاوبەشدا لە دەوری یەک کۆبکاتەوە و دەست لە دڵیان بدات. جاری وا هەیە نۆتێکیش لەو بۆ گۆڕینی ژیانی مرۆڤێک بەسە.



هەر بەو جۆرەی کە مانگی درەوشاوە

لە دڵی ئەستێرەکانی ئاسماندا بەرچاو دەکەوێت،

عاشقیش لە نێوان سەدان کەسدا

هەر بەو جۆرە دیارە. ئەو کە دەردەکەوێت،

هەموو شتێک درەوشانەوەی

خۆی لە دەست دەدات."



# دێڕی دەهەم

**ئاگری عیشقە کە بەربوو لە گیانی نەی**

**جۆششی عیشقە کە بەربوو لە گیانی مەی**

واتای زمانەوانیی مەی "شەراب"ە، لەبەر ئەوە وشەی مەیخانەیش بە واتای شەرابخانە یان ماڵی شەراب دێت.

بەڵام لە تەسەوفدا لەگەڵ واتای جۆراوجۆری وشەی "مەی" ڕووبەڕوو دەبینەوە... سۆفییەکان لە جیاتی مرۆڤێک کە بە مەی مەست بووە، خۆیان وەک مەستی عیشق پێناسە دەکەن.

تەنانەت لە تەسەوفدا "گریان"یش بە واتای بێدەسەڵاتی یان لەنێوچوون بەهۆی داماوییەوە یان کۆڵدان لە هەمبەر ڕەنج و ئازاردا نییە. لە بنەڕەتدا گریان، وەک حوزن و مەستیی عیشق بوونی هەیە.

واتا بە شێوەیەکی گشتی هەرچییەک عیشق لە سروشتیدا بێت، نە دەتوانێت ببێتە هۆی لەنێوچوون نە لە دەستدان...

لە ئەشکێک کە سەرشارە لە عیشق، کینە، تووڕەیی و تۆڵەسەندنەوە بەرهەم نایەت. ئەو ڕەنجەی بە عیشقەوە قەبولکرا بێت، ناتوانێت جودایی لە دونیا، زویر بوون لە ژیان ڕقبوونەوە لەوانی تر بەدی بهێنێت. ئەو کەسەی مەستی عیشقە، ئەستەمە زیان بە کەسێک یان شتێک بگەیەنێت، مەستییەکی لەم جۆرە تەنها تاسە و تامەزرۆیی بەدی دەهێنێت.

هەرچییەک بوو بێت، دڵێک کە لێوانلێوە لە عیشق، لە نێوان خۆڵەمێشدا دووبارە لە دایک دەبێتەوە، بێ ئەوەی دووچاری یاخیبوون، تۆڵەسەندنەوە و ڕق ببێتەوە! بەو وزە و هەست و سۆزەی کە لە عیشق وەریدەگرێت، بەردەوام بە ئەوین، جۆشوخرۆش و باوەڕەوە دەست بە ژیانەوە دەگرێت. دەست لە کامڵبوونی خۆی هەڵناگرێت. ناچێتەوە ناو قاوغەکەی خۆی، زویر نابێت... لە چاکەی نێو هەر ڕووداوێک تێدەگات، هەرچەندێکیش بەلایەوە ڕەنجهێنەر و دەردناک بێت، عیشقی ناخی لەو بەهێزتر دەبێت و لەکوێدا گوریسەکەی پچڕا، گرێی دەداتەوە و درێژە بە ڕێگەی ژیانی دەدات.

ئەم سەرخۆشییە بەهۆی عیشقەوەیە و وەها متمانەیەکی بە سیستەمی ئیلاهی هەیە کە تەنانەت گریان و سووتانیش بۆ خەڵات و پاداشت دەگۆڕێن.

دونیا لەسەر عیشق بونیات نراوە. ژیان بێ عیشق هیچ بەهایەکی نییە. بێ واتایە. کات بەسەربردنێکی بێهوودەیە. تەنانەت زانستێکیش کە عیشقی تێدا نەبێت بێ واتایە.

محەمەد فزولی[1]، لە دێڕێکدا ئەم بابەتەی بەم جۆرە باس کردووە:

'با عیشق بێت، هەرچی لە دونیادا هەیە زاست بەلام، واتەواتێک زیاتر نییە.'

واتەوات بە واتای بێهوودە بێژییە و هێندێک جاریش بە واتای لە پاشەملە قسەکردنە. واتا فزولییش لە بنەڕەتدا هەول دەدات ئەوەمان پێ بلێت ئەگەر عیشق لە زانستدا نەبێت، ئەو زانستە جگە لە قسەی پڕوپووچ زیاتر هیچ نییە.

ئەو ئامانجەی ئاوازی نەی و سەرمەستبوون بە عیشق، زیاتر لە هەر شتێکی تر بە دوایدا دەگەڕێت، بەرپاکردنی عیشق و ئەزموونکردنییەتی.

مەولانا لە هەر کردەوە و هەر قسەکردنێکدا باس لە گرنگیی بەرپاکردنی عیشق و موحیببەت دەکات. بوونی هەر گیاندارێک لە سروشتدا، هەر سەوزبوونێک لە خاک و هەر جوولەیەک لە نێو ئاودا بە عیشق بەرپا دەبێت.

---

[1]- محەمەد فزولی، شاعیر و ئەدیبی ئازەربایجانی، سەدەی دەهەم.

من هاوڕێکانم بە ڕۆحم خۆش دەوێت.
لە تاریکییەکانەوە هاتوومەتە بوون.
ڕووناکیم بینی و هەراسان بووم.
گریام.
بە تێپەڕینی کات فێربووم لە ڕووناکییەکاندا بژیم.
تاریکیم بینی و هەراسان بووم.
ڕۆژێک گەیشت هەموو ئەو کەسانەی خۆشم ویستن، بەرەو تاریکی بەڕێم کردن.
گریام.
فێری ژیانکردن بووم.
فێری ژین بووم.
لەدایکبوونم ئەو ڕۆژە بووکە لە ژیاندا مردم.
فێربووم کە مەودای نێوان ئەم دووانە کاتێکە کە لە مەرگ دزراوە...

لە چەمکی کات تێگەیشتم.
ڕووبەڕووی بوومەوە...
بە تێپەڕینی کات فێر بووم کە ناتوانم ڕووی بەڕووی کات بوەستمەوە و دەبێت بە ئاشتەوایی لەگەڵیدا بژیم.
مرۆڤم ناسی.
پاشان ئەوەی لە ناخی هەر مرۆڤێکدا باشە و خراپە بوونی هەیە.
پاشان بۆم دەرکەوت لە ناخی هەر مرۆڤێکدا باشە و خراپە دەدۆزرێتەوە.

فێری خۆشویستن بووم.
پاشان متمانه کردن...
پاشان ئەوەی کە متمانە زیاتر لە خۆشویستن دەمێنێتەوە.
پاشان بۆم دەرکەوت کە ڕۆحێک لە پشتی ئەم جەستەیەوە بوونی هەیە.
پاشان فێربووم کە ڕۆح باڵاترە لە جەستە.
جیهانم ناسی.
پاشان ڕێگەکانی ڕووناککردنەوەی جیهان فێر بووم.
پاشان فێربووم کە بۆ ڕووناککردنەوەی جیهان،
دەبێت سەرەتا دەوروبەری خۆت ڕووناک بکەیتەوە.
نانم ناسی.
هەروەها ئەوەی کە بۆ ئاشتەوایی دەبێت نان زیاد بکەیت!
پاشان بۆم دەرکەوت کە دابەشکردنی دادپەروەرانەی نان لە زیادکردنی زۆر گرنگترە.
فێری خوێندنەوە بووم.
پاشان بەرگەنەگرتن و گەڕانەوە
دوای هەموو ئەمانە، سەرەڕای حەزی خۆم، فێری ڕۆیشتن بووم.
لە گەنجێتیدا فێر بووم بە تەنیایی ئاڵنگاریی ساز بکەم...
پاشان گەیشتمە ئەوەی کە دەبێت لەگەڵ خەڵکدا بەڕێدا بڕۆی.
پاشان گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە بەڕێدا ڕۆیشتنی ڕاستەقینە ئەوەیە کە پێچەوانەی کۆمەڵ بڕۆی.
فێری بیرکردنەوە بووم.

پاشان بیرکردنەوە لە نێو چوارچێوەدا
پاشتر بۆم دەرکەوت کە بیرکردنەوەی دروست بە تێکشکاندنی
چوارچێوەکان دەکرێت.
فێری ڕەسایی (کەمال) بووم.
پاشان فێر بووم کە شەرەفمەندیی ڕاستەقینە
دووچار نەبوونە بە گوناه لە سەردەمێکدا کە نێو گوناهدا
دەژیت.
ڕۆژێک فێری حەقیقەت بووم...
تامی تاڵییەکەیم کرد
پاشان فێر بووم کە ئەگەر تاڵییەکەی بە ئەندازەی پێویست بێت
هەر بەو جۆرەی کە خواردن بەتام دەکات، ژیانیش خۆش دەکات...
فێربووم کە هەر بوونەوەرێکی زیندوو تامی مەرگ دەکات.
بەڵام ژمارەیەکی کەم تامی ژیان دەکەن...
من هاوڕێکانم خۆش دەوێت
بەڵام نە بە دڵم و نە بە عەقڵم...
چونکە دەکرێت دڵ بوەستێت
عەقڵیش لە یادی بچێتەوە
من هاوڕێکانم بە ڕۆحم خۆش دەوێت
ڕۆح نە دەوەستێت و نە فەرامۆش دەکات...



لە جیاتی گەڕان لە بیانوویەک

بۆ ناڕەحەت بوون و زویر بوون.

بەشوێن ئەو ڕێیانەدا بگەڕێن

کە بتوانن ئەوانی ترتان

خۆش بوێت و ئەوانیش

خۆشیان بوێن."



## دێڕی یازدەهەم

**نەی هاودەمی هەر کەسێکە لە یاری دابڕا**

**بە نەغمەی پەردەکانی هەموو پەردەکانمان دڕا**

بەو حەوت کونەی لەسەر نەی دروستی دەکەن، دەڵێن پەردە. واتا لەسەر نەی حەوت پەردە دروست دەکەن و ئەم حەوت پەردەیە پێکەوە ئاواز و میلۆدییەکان دەسازێنن. نەیژەن کاتێک فوو بە نەیدا دەکات، بە کردنەوەی هەر پەردەیەک لە ڕاستیدا پەردەکانی مرۆڤیش دەکاتەوە.

واتا هاوکات لەگەڵ بیستنی ئاوازەکە، هەنگاو بە هەنگاو هەر حەوت پەردەکەی مرۆڤیش کە بەدیهێنەر لە ڕۆحی خۆی فووی پێدا کردوون، دەکرێنەوە. بۆ ئەمە دەبێت لە ئارامش، ئاگایی، قەبوڵکردن و ئارامگرتندا نقووم ببین و بە پێگەیشتن بگەین.

یەکەم پەردەی مرۆڤ نەفس "نەفسی بەدکارە" و دواهەمینیان "نەفسی کامڵ"ە.

واتا ئەو نەفسەی بە ڕەسا بووە و پێگەیشتووە.

کاتێک پەردەکانی نەفسی مرۆڤ دەکرێنەوە، منگەرایی، خۆبەزلزانی و هەستەکانی وەک غرور لەودا کوێر دەبنەوە؛ واتا لەنێو دەچن و ئیتر بۆ بەری ئەو نابن. چونکە هەموو ئەمانە لە ترسەوە سەرچاوە دەگرن. مرۆڤێک کە بە خۆی و سیستەمی ئیلاهی بێمتمانە بێت، بەهۆی ترسییەوە بەرەو پاراستنی منگەرایی خۆی دەجووڵێت و دووچاری خۆبەزلزانی، هەڵپەکردن، خۆپەرستی و ئیرەیی دەبێتەوە. بەڵام مرۆڤی ڕەسا دڵنیایە کە لە دڵنیاییدا دەژی. باوەڕی بە سیستەمی ئیلاهی تەواو و ڕەسایە، بەبێ پرسیارە و باوەڕێکی بێ کۆتوبەندی هەیە. کاتێک پەردەکان کرانەوە، ئەزموونێک لە متمانەی بێ پایان و تەواوەتی دەست پێ دەکات. مرۆڤ هەرچەندێک لە متمانە دوور بکەوێتەوە، دەکەوێتە داوی "جودایی"ەوە. ئەم جوداییە واتا دوورکەوتنەوە لە بەدیهێنەر، بێ متمانەیی بە سیستەم و دادپەروەریی ئەو، دووچار بوون بە هەڵپەهەڵپ، خۆبەزلزانی، ترس و ئیرەیی کە هەموویان دەبنە هۆی ئەوەی مرۆڤ ئەزموونێک لە کاڵای ونبوون و گومڕایی هەبێت.

مەولانا لەو باوەڕەدایە ڕێنمای مرۆڤێک کە ڕێی لێ ونبووە و سەرگەردانە کەوتووە، دەنگ و نەجوای ئیلاهییە...



**مالئاوایی بۆ ئەو کەسانەیە**
**کە بە چاوەکانیان عاشق بوون،**
**چونکە کەسێک کە بە دڵی عاشق بووبێت،**
**هەرگیز جیا نابێتەوە."[1]**



---

١- بۆ ساتێکیش لە گیانم ئارەزووی تۆ نەڕۆیشت     لە دڵ ئارەزووی ڕووی جوانی تۆ نەڕۆیشت
هەر کەس هاتە سەر ڕێگەی تۆ دڵی بە جێما     کەس بە دڵی خۆیەوە لە زێدی تۆ نەڕۆیشت
ئەبوسەعید ئەبولخەیر

## دێڕی دوازدەهەم

**هەر وەکوو نەی کێ ژەهر و بەنگێکی وای دی؟**

**هەر وەکوو نەی کێ تامەزرۆ و هاودەنگێکی وای دی؟**

هەمیشە ئەو کاتانەی کە قوتابییەکانم ناچار بە گوێگرتن لە ئاوازی نەی دەکەم، لێیان دەپرسم: "هەستتان چۆن بوو؟" لە کۆی ئەو پرسیارانەی ساڵانێکە لەوانی وەردەگرمەوە، گۆڕانێکی ئەوتۆیان بەسەردا نەهاتووە:

"ڕەنج و ئازار"

"خەم و خەفەت"

"چالاکی"

"دەسەڵات"

"ترس"

"ئارامی"

بەڕای تۆ زۆر سەیر و سەمەرە نییە کە ئاوازی یەکسانی نەی، هەم ڕەنج، هەم ئارامی و هەم شادی لە مرۆڤدا بەدی دەهێنێت؟

دەبێت لەم لایەنەی نەیسازی بکۆڵرێتەوە و لەبارەیەوە گفتوگۆ بکرێت. نموونەیەکی سەرەتا لەبارەی دەروون و بەدیهاتنی مرۆڤە.

بێهوودە نییە کە مەولانا ژیان و مرۆڤ بە نەی بەراورد دەکات.

مەولانا لە دێڕی دوازدەهەمی مەسنەویدا دەڵێت کە ئاوازی نەی بە هەر کەسێک ئەوەی پێویستییەتی پێی دەبەخشێت. بۆ یەکێک ژەهر و بۆ یەکێک دژەژەهر...

یار و هاوبیرێکە بۆ دەردمەندان، غەمگینان، ئەو کەسانەی ئازار دەچێژن و ئەوانەی نووقمی شادین و شادومانن.

چونکە هەموو ئەمانە لە ژیاندا بوونیان هەیە. ناڕەحەتی سزادان نییە، ئەزموونە. شادی و چالاکییش پاداشت نییە. ئەویش هەر ئەزموونە. هەر کام لەمانە لە ژیاندا بوونیان هەیە و ئەزموونی مرۆڤایەتین.

هەستەکان کۆمەڵێک سەرەداو سەبارەت بەوەی کاروباری ژیانی مرۆڤ ڕێکوپێکە یان نا، بەو دەدەن. ئەو جێگا و شوێنانە دەستنیشان و دیاری دەکات کە پێویستە لێی ورد ببینەوە، تەرکیز بکەینە سەری، هەوڵی تێدا بدەین، یان بیپارێزین، بەرپرسیارێتیی هەڵبگرین و یارمەتی بگەیەنین.

هەر ڕووداوێک بۆ مرۆڤ چاکە و کۆمەڵێک ئەزموونی بۆ ئەو لەگەڵدایە.

لە ڕاستیدا ئەوە ڕاست نییە کەهێندێک لە هەستەکان بە ئەرێنی و هێندێک بە نەرێنی ناو ببەین...

هەر هەستە و شتێک بە مرۆڤ دەڵێت...

گرنگ ئەوەیە کە گوێی بۆ ڕادێریت و بزانی دەیەوێ چی بڵێت.

گوێ ڕادێرە!

گوێ ڕادێرە بزانە هەستەکانت چیت پێ دەڵێن!

شتێک بە ناوی شادیی هەمیشەیی بوونی نییە. لە ژیاندا بە ئەندازەی شادی، پرسگەلێک هەن کە ناڕەحەتت بکەن. بە ئەندازەی ئارامی، نائارامی بوونی هەیە. هەست بە هەموو ئەمانە دەکەین. چونکە شەو بوونی هەیە، دەتوانین ڕۆژ ببینین. چونکە ڕەش هەیە دەتوانین سپی ببینین. هەست بە بوونی هاوسەنگی بکە لە ژیاندا.

شادی و ئارامیی یەکبینە بوونی نییە. ئەمە ئامانجێکی نابەجێیە... ئەستەمە. ئەفسووس کە مرۆڤی بەلەزی سەدەی ئێستامان فریو دراوە تا بەدوای شادیی بەردەوامەوە بێت. سەرەڕای ئەوە، ناچار کراوە و بەم بابەتە ڕاهێنراوە... هەر هێندەی کەمێک هەست بە نائارامی و ناڕەحەتی بکات، لە بیرکردنەوەدا ڕۆ دەچێت و نازانێت دەبێت چی بکات. بۆ ئەوەی کۆمەڵە ڕێگەیەک بۆ شادییە کورتخایەنەکانی خۆی فەراهەم بکات، جگەرە دەکێشێت

یان مادده هۆشبەرەکان بەکار دەهێنێت، خواردنەوە کحولییەکان دەخواتەوە، زیاد لە ئەندازە دەخوات، سەیری تەلەفزیۆن دەکات و بەدیار زنجیرەکانەوە دادەنیشێت. کۆمەڵێک وابەستەیی بۆ خۆی ساز دەکات. بەڵام ئەگەر قەبوڵی بکات بوونی ئەم ڕەنج و ئازارانە سروشتین و ژیانکردن هەڵبژێریت، ڕەنج و ئازار زوو تێدەپەڕن. بەڵام هەر هێندەی کە لە ڕەنج و ئازار هەڵدێت، تێپەڕینیش لێی دژوارتر دەبێت. لە بەرانبەر ئازاردا بێتوانا دەبێت.

لە نەخۆشخانەدا دەزگای ئەلیکترۆکاردیۆگرافتان بۆ پشکنینی لێدانی دڵ بینیوە. هێڵکاریی دڵی مرۆڤێکی زیندوو چۆنە؟



ئێستا هێڵەکانی ئەم دەزگایە بۆ کەسێکی مردوو، بە چ شێوەیەکە؟

ئەگەر زیندوویت لە ژیاندا هەم نشێو بوونی هەیە هەم هەوراز.

تەنانەت کەسێک کە هیچ کێشەیەکی نییە، دەبێت بترسێت. چونکە لەوانەیە پێی نەزانێت کە مردووە...

ئەم ژیانە هاوسەنگییەکە بەهۆی دژوازییەکانەوە بەرقەرار دەبێت...

هەبوونی ئەو هۆشیارییە کە تا ڕەش نەبێت، سپییش بوونی نابێت، گوڵی بێ دڕک بوونی نییە...

ئەم قۆناغە، وێستگەی ئارامگرتنە.



"دژوازییەکان لە دڵی دژوازییەکاندا دەردەکەون.
تا باشە نەناسیت، خراپەیش ناناسیت.
ئەی براکەم، هەموو شتێک بەهۆی دژەکەیەوە
دیارە و دەبینرێت؛ لە کەنار زەریا مرواری
لە نێوان زیخ و بەردۆچکەکاندا دەدۆزرێتەوە."



## ڕەتکردنەوەی دژوازییەکان
## ڕەتکردنەوەی هاوسەنگییە لە ژیاندا

ڕۆژگارێک لە گوندێکدا درەختێکی گەورە بوونی هەبوو کە لە قەدەکەیەوە دوو لقی ئەستوور گەشەیان کردبوو. لقێکیان میوەیەکی بە مرۆڤەکان دەدا کە ژیان و تەندروستی بە مرۆڤەکان دەبەخشی. لقەکەی تر میوەی ژەهراوی و کوشندەی هەبوو.

بە تێپەڕینی کات مرۆڤەکان بیریان دەچوویەوە میوەی کام لق ژیان دەبەخشێت و کامیان کوشندەیە. ڕۆژێکیان پیرەمێردێک بە شەلەشەل دێتە تەنیشت درەختەکە. بە شوێن میوەی ژیانبەخشدا بۆ کوڕەزا نەخۆشەکەی کە لە سەرەمەرگدا بوو، دەگەڕا. بەڵام نەیدەزانی کام لقەیان میوەی چارەسازی هەیە.

هەر بۆیە دەڕوت بۆ لای خەڵکی گوندەکە و بۆ لای خۆی بانگیان دەکات.

پاشان پێیان دەڵێت: "من میوەی یەکێک لە لقەکان لێ دەکەمەوە و دەیخۆم. ئەگەر مردم، بزانن کە میوەی لقەکەی تر چارەسازە. دانەیەک لێ بکەنەوە و بیدەن بە نەوەکەم تا چاکی بکاتەوە."

خەڵکی گوندەکە پێشنیازەکەی قەبوڵ دەکەن. هەمووان چاوەڕێ بوون. پیرەپیاو میوەیەکی لێکردەوە و خواردی. پاشان چی ببینن باشە؟ مووە سپییەکانی پیرەپیاوەکە ڕەش بوونەوە، پشتە کۆماوەکەی لە پڕێکدا ڕاست بوویەوە. چرچ و لۆچەکانی ڕووخساری نەمان. بوو بە پیاوێکی گەنجی قۆز. بەم شێوەیە لقی میوە چارەسازەکەیان دۆزییەوە. میوەیەکیشی لێ کردەوە و بردی بۆ نەوەکەی: ئەویش دەستبەجێ چاک بوویەوە.

خەڵکی گوندەکە دەستیان بە کۆکردنەوەی میوە چارەسازەکانی درەختەکە کرد. بە تێپەڕینی کات، بیرۆکەیەک بە سەریاندا هات. "ئەگەر منداڵەکانمان بە هەڵە لە میوە کوشندەکە بخۆن، دەمرن. باشترە ئەو لقەی میوە کوشندەکان دەگرێت ببڕینەوە و تەنها لقی میوە ژیانبەخشەکە بمێنێتەوە و گەشە بکات، بەسە."

هەمووان لەم بابەتەدا گەیشتبوونە لێک تێگەیشتن و کۆک بوون. ئەو ڕۆژە لقە کوشندەکەیان بڕییەوە. بەڵام بۆ ڕۆژی دواتر ڕووبەڕووی دیمەنێکی چاوەڕواننەکراو بوونەوە. لقی میوە ژیانبەخشەکە هێواش هێواش خەریک بوو وشک دەبوو.

دوای ئەمە بۆیان دەرکەوت کە لە ژیاندا هەموو شتێک لەگەڵ دژەکەی خۆیدا هاوڕێیە.

ڕەتکردنەوەی شتە دژەکان بە واتای ڕەتکردنەوەی هاوسەنگیی ئامادەیە لە ژیاندا. بە واتای قەبوڵنەکردنی حەقیقەتە. ڕاوەستانەوەیە لە هەمبەر سیستەمی کائیناتدا.

وەستانەوە زیانهێنەر و وێرانکەرە. نەرمونیانی و قەبوڵکردن خەسڵەتێکە بە تەنها بۆ لە ئامێزگرتنی ژیان بەسە... لەبەر ئەوە قەبوڵی ئەوە بکە چ باش و چ خراپ ژیان هاوسەنگییەکی هەیە و بەم قەبوڵکردنە، درێژە بە ژیانت بدە.



لە هەر جێیەک کێشە هەبوو، چارەسەر بۆ ئەوێ دەڕوات

لە هەر شوێنێک کەشتی هەبوو، ئاو بۆ ئەوێ دەڕوات

کەم بەشوێن ئاودا بگەڕێ و تینوێتی بەدەست بهێنە

تا لە ئاسمان و زەوییەوە ئاو بێتە خوار و هەڵقوڵێت

تا نەیەتە دونیاوە منداڵی ناسک گەروو

کەی دێتە دەر لە سینەی دایک شیر



## دێڕی سێزدەهەم

**ئەی بەسەرهاتی ڕێگەیەکی پڕ لە خوێن دەڵێتەوە**

**ئەی چیرۆکەکانی عیشقی مەجنوون دەگێڕێتەوە**

مەجنوون کە نەیدەتوانی بە عیشقەکەی لەیلا بگات، سەر بۆ سارا هەڵدەگرێت. هەروا کە خەریک بوو دەردی جودایی لە مەعشووقەکەی خۆی دەچەشت و خۆی لە پەیوەستە دونیاییەکان دوور دەخستەوە، بۆ دەرکەوت کە عیشقی سووتێنەری ناو دڵی، پارچەیەک لە بوون، ژیان، مەرگ و سیستەمی ئیلاهییە. ڕێک وەک ئەوەی لە گەڕان بە شوێن لەیلادا بە مەولا (خودا) گەیشتبێت...

چیرۆکی مەجنوون و لەیلا لەم ڕووە زۆر تایبەتە. تەنها دابڕانی دوو مەعشوق لە یەکتر نییە، دۆزینەوەی دڵنیایی و پارێزراویی ئیلاهییە لە کاتێکدا کە دەستت لە پەیوەستە دونیاییەکان هەڵگرتووە. بڵێسەدانی ئاگری عیشقی ئیلاهییە.

هەڵبەتە مرۆڤ لە هەر بەشێک لە ژیانیدا ئەوەی چاندوویەتی، دەیدوورێتەوە. پرسی باشە و خراپە یان دروستی و نادروستی نییە. چیرۆکەکە ئەوەیە کە بۆ هەر بەرهەمێک تۆوێک چێنراوە... هەر کەسێک ئەنجامی ئەو زەحمەتەی کێشاویەتی وەردەگرێتەوە. هەڵبەتە ئەنجامی کارەکەی بە چۆنییەتی ئەو تۆوەوە پەیوەستە کە چاندوویەتی.

تا زەحمەتێک بوونی نەبێت، ڕەحمەتێک لە ئارادا نابێ.

لەیلات خۆش بوێ، بەڵام ئەو خودایەیش کە عیشقی خستۆتە دڵی لەیلاوە بدۆزەرەوە.

خوێندنەوەی چیرۆکی لەیل و مەجنوون سەرەڕای ئەوەی خوێنەر دەخاتە ژێر کاریگەریی عیشقی دوو مەعشوقەوە، بۆ جۆرێک لە هۆشیارییش بانگهێشتی دەکات.

سەرچاوەی عیشق، خودی مەعشوق نییە. بەڵکوو لەو واتایەوە کە بە ئەو دەدرێت، ئاوازی موحیبەتێک دەنگ دەداتەوە، ڕووخۆشی و کراوەیی، تێگەیشتن و کانیاوێکی سەرتاسەر جوانی لێیەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەو کەسەی کە خانەخوێی ئەم سەرچاوەیەیە خودی عاشقە. هەر شتێک لە خۆیدا هەیە، دەیداتە پاڵ مەعشوق. ئەوەی کە داستۆیۆفسکی لە ڕستە بەناوبانگەکەیدا دەیویست بیڵێت: "ئەوەی جوانە مەعشوقەکەی تۆ نییە، بەڵکوو ئەوە مەعشوقە کە جوان دێتە بەرچاوت." ئەو خەسڵەتانەی دەیاندەینە پاڵ مەعشوق جوانن و خانەخوێی ڕاستەقینەی ئەم خەسڵەتانە، دڵی خودی عاشقە.

بێگومان عیشقی هەڵقوڵاوی ناو دڵی عاشق لە کانیاوی عیشقی ئیلاهییەوە سەرچاوەی گرتووە.

حەزرەتی عەلیش (سڵاوی خودای لەسەر بێت) ئەم بابەتەمان بیر دەخاتەوە: **"بەندەی ئەوی تر مەبە، لە کاتێکدا خودا تۆی بە ئازادی بەدیهێناوە."**

دەمەوێ کە ئێستا دەرفەت هاتە پێشەوە، یەکێک لە چیرۆکە کورتەکانی مەجنوون و لەیلاتان بۆ بگێڕمەوە کە سینە بە سینە گوازراوەتەوە:

مەجنوون ڕۆژێک دەبیستێت کە لەیلا خەریکی دابەشکردنی خواردنە لە نێوان گوندییەکاندا و بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە یەکسەر دەڕوات بۆ ناو گوند. ڕیزێک بۆ وەرگرتنی خواردن دروست کرا بوو. دەچێتە ناو ڕیزەکەوە. هەر کە نۆرەی دێت بۆ وەرگرتنی خواردن، لەیلا بە پشتی کەوگیرەکەی دەکێشێت بە دەستیدا و خواردنی پێ نادات.

دوای ئەم ڕووداوە مەجنوون دیسان دەچێتەوە کۆتایی ڕیزەکە و نۆرە دەگرێتەوە. کاتێک سەرەی دەگاتێ، دیسان لەیلا بە پشتی کەوگیرەکەی بە دەستیدا دەکێشێت و هیچی پێ نادات.

مەجنوون داماو لە گۆشەیەکدا چاوەڕوان دەمێنێتەوە تا خەڵکەکە بڵاوەی لێ بکەن. کاتێک هەمووان دەڕۆن، دەچێت بۆ لای لەیلا و لێی دەپرسێت: "بۆچی خواردنت نەدا بە من؟"

لەیلا بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە:

"ئەی مەجنوون، هەمووان داوای ئەو خواردنەیان دەکرد کە پێم دەدان؛ لانیکەم تۆ داوای خۆمت بکردایە!"

سۆفییەکان لەو باوەڕەدان کە ئەم چیرۆکە بەیادهێنەرەوەی ئەم بابەتەیە کە داوای بەهەشتی خودا مەکە، داوای خودی خۆی بکە. مرۆڤ نابێ بۆ گەیشتن بە هەشت یان ڕزگاربوون لە دۆزەخ خوداپەرستی بکات، بەڵکوو دەبێ بۆ گەیشتن بە حەقیقەت هەوڵ بدات.

**"بەهەشت بەو کەسانە ببەخشە کە خوازیاری کۆشک و حۆرییەکانتن. بۆ من تۆ خۆت بەسیت..."**

یونس ئیمرەیش هەر بەم هەستانە عیشقی خۆی بۆ خودا دەردەبڕێت... مەگەر هەوڵدان بۆ پاداشت یان پاراستنی خۆت لە سزا یەکسانە بەوەی کە هەموو شتێک بە گیان بکڕیت تا بەشوێن حەقیقەتێکی بێ کۆتوبەندەوە بیت؟



**"گیانی گیانانی من**
**تا بۆ ڕادەستبوون ئامادە نەبوویت،**
**بە کەس مەڵێ کە من عاشقم."[1]**



---

١- تا بەرهەمی دەردم بوو بە دەرمان نشێوم بوو بە هەوراز و کوفر بە ئیمان
گیان و دڵ و لەش پەردەی ڕێ بوون، نووکە لەش بوو بە دڵ، دڵ بە گیان و گیان بە گیانان

چوارینەی ژمارە ٢٦١ دیوانی مەولانا

# دێری چواردەهەم

**ئەم هۆشە مەحرەمە، بەڵام بۆ بێهۆشان نییە**

**جگە لە گوێ، کەس مشتەری زوبان نییە**

مەولانا دەڵێت ئەگەر مرۆڤ مەنتیقی هەموو ڕێگەکانیش بزانێت، کاتێک دەگاتە سەر ڕێگەی عیشق هەموو شتێکی بیر دەچێتەوە و سەراسیمە دەمێنێتەوە.

تەیکردنی ڕێگەی عیشق بە لۆژیک نییە. کارایی عەقڵ لە تەسەوفدا ئەوەیە کە خواردنەکە نەڕێژیت بە خۆتدا...

تەنها بە دڵ دەتوانی بە ڕێدا بڕۆیت... بەبێ ئامار و ئەژمار، بێ هەڵسەنگاندن، بە بیرنەکردنەوە لە سەر و ژێری، بێ بەرنامەڕێژی، بێ پرسیار، بێ نیگەرانی و پەرێشانی و بێ هیچ ترسێک...

تەسەوف حاڵەتێکە لە ڕادەستبوون و متمانە و دڵنیایی...

لەسەر بنەمای هەستێک لە دڵنیایی ناخەوە بەرز دەبێتەوە...

ناکرێت مامەڵە بە سیستەمی ئیلاهییەوە بکرێت، عەقڵی هیچ کەسێک سەرتر لە سیستەمی ئیلاهی نییە...

"ئەگەر خۆشیان بوێم، خۆشم دەوێن، ئەگەر ڕاستگۆیی ببینم، ڕاستگۆ دەمێنمەوە، ئەگەر بمەوێ بیبەمەوە، هەوڵ دەدەم، ئەگەر بزانم دەیهێنێ، بەڕێ دەکەوم، ئەگەر سوودی بۆم هەبێت، سوودی پێ دەگەیەنم، ئەگەر چەترم پێ بێت، دەڕۆمە ژێر بارانەوە..."

فەرهەمبوونی هەلومەرج، تەڵەکانی عەقڵ و مەنتیقی مرۆڤن.

نیوەدێڕی "ئەم هۆشە مەحرەمە، بەڵام بۆ بێهۆشان نییە" ڕێک ئاماژە بە ئازادی و ڕەها بوونی ئەوان لەم هەلومەرجانە دەکات.

ئەو کەسانەی عیشقەکەیان وابەستە بە هەلومەرج کۆت و بەندەوە نییە، هەوڵەکانیان تەنها بۆ براوە بوون نییە، هەمان ئەو کەسانەی کە نیگەرانی بەرژەوەندیی خۆیان نیین و ئەژمارگەرانە کار ناکەن، بە دڵنیاییەوە دەزانن بۆچی دەژین.

بێگومان ئەو هۆشیارییانەی ئەم کەسانە بۆ بوونە مرۆڤ بەدوایانەوەن، زۆر بەهادار دەبن. ئەو وشانەی دێنە سەر زاریان، زایەڵەیەکی جوان لە جیهاندا بەرپا دەکەن...

بەهای مرۆڤێک لە چیدایە؟
هەر شتێک تۆ بەدوایەوەیت، ئەو شتەیت!
ئەگەر تۆ بەشوێن گیانانەوەیت، بزانە کە خودی گیانیت.
ئەگەر بەشوێن پارووپەک نانەوەیت، بزانە کە پارووپەک نانیت.
ئەگەر بتوانی لە خاڵی شاراوەی ئەم ڕستەیە تێبگەیت،
دەزانیت کە ئەوەی بەدوایەوەیت خۆتی، خۆت.
تا بە شوێن گەوهەرەوەیت لە کانێکدا، کانیت.
ئارەزووی پاروووە نانێک بکەیت، نانیت.
ئەگەر لەم ڕستە ڕازئامێزە تێبگەیت، هەموو شتێک بۆت ئاشکرا دەبێت.
بەدوای هەر شتێکەوە بیت، ئەو شتەیت!
لە دەروونی تۆدا "گیانێک" بوونی هەیە، بەدوای ئەو گەوهەرانەوە بە
بەڵام لە دەرەوەی تۆ نییە ئەوەی لە جیهاندا هەیە
داوا لە خۆت بکە هەرچییەکت دەوێ، چونکە خۆتی...
من جگە لە "عیشق" هیچ یارێکم نەبووە و جگە لەوەیش هیچ یارێکی تر نادۆزمەوە.
پێش و پاش دونیام بەبێ عیشق بەسەر بەرد
گیانم لە ناخەوە بەم جۆرە بانگم دەکات:
ئەی موسافیری پێگەیشتووی ڕێگەی عیشق، دەرگا لە من بکەرەوە!



عیشـق سـەرئەنجامی چارەنووسە
نەک سـەرئەنجامی ئامار و ئەژمار.
عیشق فیداکارییە نەک لەدوو گەڕان.
ئەگـەر تۆ لـەم ڕێیەدا فیداکاریت کردووە و
سـووتاویت، عیشـق لە تۆ بەدوور نییە!"



CamScanner

# دێڕی پازدەهەم

**لە خەمی ئێمەدا ڕۆژگار بێ دەم و سات بوو**

**ڕۆژگار لەگەڵ خەم و مەینەتیدا هاوکات بوو**

هەر مرۆڤێک تایبەتە بە خۆی، هەر مرۆڤێک ڕەوتێکی تایبەتی بۆ پێگەیشتن هەیە، ئەو پەیام و واتایەی لەسەر زەوی هەیەتی، تایبەتە بە خودی ئەو. ڕێک وەک پەنجەمۆر... لەم ڕووەوە سەفەری هەر کەسێکیش جیاوازە لەوی تر. ڕێگەی کەسێک دەکرێت بۆ کەسێکی تر نموونەیی نەبێت. هەر ئەزموونێک دەکرێت لە هەر کەسێکدا بۆ ئەزموونێکی جیاواز بگۆڕێت. دەکرێت کەسێک بە ئەزموونێک سەرلەنوێ لەدایک بێتەوە و ئەوی تر ببێتە هۆی دواکەوتنی خۆی و خۆی بەو ئەزموونەوە گرێ دەدات. هەردووکیان ئەرکی جیاوازیان لە دۆخی یەکسان خستۆتە سەر شانی خۆیان. نە باش و نە خراپ، نە دروست و نە هەڵە... لە کۆتاییدا هەر دووکیان ئەوەی پێویستیان پێی بووە، دۆزیویانەتەوە.

مەولانایش ئەوە بەیان دەکات کە هەر کەسێک لە کاتێکی تایبەتدا لەم عیشقەدا دەسووتێت. ئەم پرسە بەدڵنیاییەوە لەگەڵ ئاستی ڕەسایی ئەو لە پەیوەندیدایە. هێندێک جار کەسێک بە لەدەستدانی ئەزیزترین کەسیشی ناسووتێت،

هێندێک جار کەسێک ماڵەکەی لەدەست دەدات و دەبێت بە خۆڵەمێش. ناتوانم بڵێم یەکێک ڕاست و یەکێک هەڵەیە. هەر ڕۆحێک چارەنووسی گەشە و ڕەسایی خۆی تێدەپەڕێنێت. ناتوانین بە کەس بڵێین بۆچی بە لە دەستدانی ئەزیزترین کەست نەسووتایت و نەبوویت بە خۆڵەمێش! لەکوێوە بزانین کە چەندین جار لە چ خۆڵەمێشگەلێکەوە دووبارە لەدایکبۆتەوە. هیچ مافێکمان بۆ سەرزەنشتکردنی ئەو نییە. پەیوەندیی ئەو لەگەڵ پەروەردگاری پەیوەندییەکی تایبەتییە. تەنانەت ناتوانم بە کەس بڵێین بۆچی لەبەر ئەوەی کەمێک لە ماڵەکەت لەدەست داوە، ئەوەندە سووتایت و بوویت بە خۆڵەمێش! لەکوێوە بزانین بە کام لە ترسەکانی تاقی کراوەتەوە؟ لەم بارەیەشەوە ڕووخسەتی سەرزەنشت و داوەرییمان نییە.

سووتانی مەولانا بە ڕۆیشتنی شەمس دەستی پێ کردووە. ئەوەی کە بڵێین "تۆی مەولانای مەزن چۆن بە ڕۆیشتنی هاوڕێیەک ئاگرت تێ بەر بووە و ئاوا سووتاویت؟" تێپەڕاندنی سنووری خۆمانە. ئاگری هیچ کەس لەگەڵ ئەوی تر بەرابەر نییە. تەنانەت تێگەیشتنی هەر کەسێک لەم ئاگرە پەیوەستە بەوەی لە چ ئاستێکی پێگەیشتندایە. دەتوانێت جیاواز بێت. چونکە بۆ هێندێک تەنانەت مەرگیش کۆتایی نییە... مەگەر دەکرێت لەو ئاستەی پێگەیشتنی ڕۆحدا نەبیت و بزانیت نەبوونی شەمس دەبێتە هۆی چ شتێک؟

هەر بەو جۆرەی کە لقی نەی بۆ ئەوەی ببێت بە ساز، ساڵێک لە چاوەڕوانیدا دەمێنێتەوە، مەولانایش لە ڕێگەی پێگەیشتندا چاوەڕێی شەمسی دەکرد...



'عیشق بە ئەندازەی وێناکردنی تۆ نییە،

بەڵکوو بە ئەندازەی سووتانی تۆیە.'



# دێڕی شازدەهەم

**ڕۆژەکان گەر ڕۆیشتن بڵێ بڕۆن، باک نییە**

**تۆ بمێنەرەوە ئەی ئەوەی کەس وەک تۆ پاک نییە**

ڕۆژەکان تێدەپەڕن، بەڵام شەمس ناگەڕێتەوە...

دیسان دەبێت ئەم بابەتە قەبوڵ بکرێت کە باڵاترین قۆناغی ئەزموونی مەولانا ئەم دابڕانە بوو...

مەولانا هەرگیز یاخی نەبوو.

بە پیشاندانی ئارامی و پشت بەستن بە خودا لەو قۆناغەدا کە زۆر بەلایەوە دژوار و بەئازار بوو، توانیبووی ئەمەیش تێپەڕێنێت.

هیچ کام لە هەستەکانی چوون هەڵپەکردن، توورەیی، پرسیار، تۆڵەسەندنەوە، پاککردنەوەی حیساب، ڕووبەڕوو بوونەوە و تێکگیران لە دڵیدا بەدی نەهات. هێشتاکەیش ئارەزوویەکی باشیی بۆ کەسێک دەکرد کە بە نەبوونی دڵی ئەوی داخ کردبوو.

لێرەدا باسمان لە خەمێکی بەجێ یان نابەجێ، نییە. تەنها لە هەوڵدایە تا سەرنج بەرەو لای قەبوڵکردن بەرێت.

ئەگەر مرۆڤ هێزی پێویستی بۆ گۆڕینی بابەتێک نییە، باشترە بۆ قەبوڵکردنی هەوڵ بدات. سەرەڕای ئەمەیش یەکەم یاسا بۆ گۆڕینی شتێک قەبوڵکردنییەتی.

لە جیاتی دەرگیر بوون لەگەڵ ئەوەی ڕووی داوە، گۆڕینی ئاڕاستەی سەرنجمان بۆ ئەو شتانەی ئەم بابەتە فێری ئێمەی دەکات، دەبێتە هۆی سارێژبوونی برین و زووتر چاکبوونەوەمان.

لێرەدا بابەتی گرنگ دیسان گوێڕادێرانە.

مەولانا دیسان سەرنجەکان بە ئاڕاستەی توانای گوێگرتن کە لە مرۆڤدا هەیە، دەبات...

بۆیە دەڵێت: "گوێبگرە!"

چونکە دەزانێت هەر چەندێکیش ئازار بچێژێت، ئەم ڕەنج و ئازارە ئەو بە پێشگەیشتن دەگەیەنێت بە تێپەڕینی کات دەیکا بە شاعیرێکی گەورە. لە نامەیەکدا کە بۆ شەمسی دەنووسێت، دەڵێت: "ئیتر فێر بووم کە عیشق مرۆڤ گەورە دەکات و پێی دەگەیەنێت؛ تا ئەم تەمەنە هیچ کەس ئەمەی فێری من نەکردبوو."

مەولانا دوای ماوەیەک ئیتر بەدوای حەقیقەتێک لە هاوڕێ هاودڵەکەی خۆیەوە نەبوو؛ بە پێگەیشتنێک گەیشتبوو کە تەنانەت بە چەند درۆیەکیش لەبارەی ئەوەوە ئارام دەبوویەوە.

مەولانا کاتێک بە شوێن شەمسدا دەگەڕا، لەگەڵ کەسێک ڕووبەڕوو دەبێتەوە کە لە قونیە بە درۆکردن بەناو بانگ بوو. ئەو پیاوە دەڵێت کە شەمسی لە بەغداد بینیوە. مەولانا بە بیستنی ئەم قسەیە سوپاسی دەکات و عەباکەی خۆی بە دیاری پێ دەبەخشێت. ئەو کەسەی لای مەولانا بوو، وتی: "لەگەڵ ئەوەی کە دەزانی ئەم پیاوە درۆزنە، بۆچی عەباکەی خۆت پێ دا؟"

مەولانا وتی: "لەبەر درۆکەی عەباکەی خۆم دایە، ئەگەر ڕاستی بوتایە گیانی خۆمم پێ دەبەخشی..."

ئەو لە چاوەڕوانییەکی ئاگریندایە، بەڵام بە هەمان ئەندازە توانای قەبوڵکردنێکی بەهێزیشی هەیە.

لە دیدی مەولاناوە لە سەختترین ساتەکان و هەلومەرجە دژوارەکانی ژیاندا جوانترین دیارییەکان بە ئێمە دەدرێن. بەهارەکان لە دڵی زستاندا شاردراونەتەوە، لە زستان هەڵمەیە و لە بارانەکان زویر مەبە...



دەزانم بەم عیشقە

لە شوێنێک جێگە ناگریت،

چونکە دونیا تەنگە بۆت.

بەڵام ئارام بگرە دڵم؛

ئارام بگرە کە دوای هەر تاریکییەک،

ڕۆشنایی هەیە."



# دێڕی حەڤدەهەم

**هەر کەس جگە لە ماسی، لە ئاو تێر بوو**

**هەر کەس بێ ڕۆزییە، ڕۆژی لێ دێر بوو**

لە دێڕی حەڤدەهەمدا ماسی خوازەیە بۆ عاشقێک کە دووچاری عیشق بووە... مەولانا بەم جۆرە دەری دەبڕێت کە جگە لە عاشقان هەمووان دەڵێی لە ئاوێکیان خواردۆتەوە و تێر بوون، بەڵام عاشقی ڕاستەقینە وەک ماسییەکە لەگەڵ ئەوەی لە ئاودا مەلە دەکات، هەرگیز لێی تێر نابێت.

زۆر بەهادارە کە مرۆڤ لە دونیایەکی ناسنووردردا تا ئەو جێیەی کە دەتوانێت لەسەر ڕێگەی پێشکەوتنی خۆی هەنگاو بنێت. بەم شێوەیە هەر هەناسەیەک کە هەڵی دەمژێت، هەر ئەزموونێک کە تێی دەپەڕێنێت، هەر هەنگاوێک کە هەڵی دەنێت، لەودا بە شێوەی دیدگایەکی نوێ، هۆشیارییەکی نوێ، چێژ و گەیشتن بە مامۆستایەتی خۆی دەردەخات.

ئەگەر بلێیت "ئەمە لە هەموویان ڕاستترە" دڵی خۆت لە هەمبەر وەرگرتنی ڕاستترینەکانی دواتردا دادەخەیت.

ئەگەر بلێیت "عیشق هەر ئەمە بوو" دڵی خۆت بەرانبەر عیشقی واقیعی و ڕاستەقینە دادەخەیت.

بەڵام مرۆڤ دەبێت بتوانێت بە فراوانیی ئۆقیانوس بێت. مرۆڤ دەبێت بە ئەندازەیەک قووڵ بێت کە سەرڕێژ نەبێت.

ڕۆژێک پیاوێک بە بایەزیدی بەستامی وت: "بە ئەندازەیەک ئاوم خواردۆتەوە کە ئیتر تینوو نەبم."

بایەزیدی بەستامی بەم جۆرە وەڵامی دایەوە:

"حەقیقەت ئەوەیە کەسێک زەریا بخواتەوە و تەواوی بکات، پاشان بپرسێت دیسان هەیە."

بەشێوەیەکی گشتی زۆر گرنگە کە مرۆڤ بەم خاڵە لە داخوازی بکات...

دەبێت پرسیارێک بکەین، لە دووی وەڵام بگەڕێین، سەرقاڵی فێربوونی زانست ببین، فێری خۆشویستن ببین، باوەش بۆ ئەزموونەکان بکەینەوە و هەوڵ بدەین تا بە عیرفان بگەین...

هەڵبەتە ڕاستییەکیش بەناوی "قیسمەت"ەوە بوونی هەیە، بەڵام قیسمەت کەسێک کە لەسەر ڕێیە، دەبینێت و هەرچییەکی پێویست بێت، دەیخاتە بەردەمی. ئایا دەکرێت کەسێک کە لە قەراغ ڕێگە چاوەڕێیە و لە ژیاندا تەماشاگەرێک زیاتر نییە، بەشی خۆی لە قیسمەت وەربگرێت؟

لەم قۆناغەیشدا مرۆڤ دەبێت دوور بێت لە ئامار و ئەژمار. لە پێکهاتەی سەفەری عیشقدا جێیەک بۆ وتنی ئەم ڕستانە نییە کە "بەشی من هەر ئەوەندە بوو." یان ئەگەر لە کۆتایی کارەکەدا، شتێکمان بەر دەکەوێت، با هەوڵ بدەین."

**عیشق کاری قیسمەتە، نەک ڕووداوێک کە بەرهەمی ئامار و ئەژمار بێت. عیشق خۆ تەرخانکردنە، نەک لەدوو گەڕان. ئەگەر خۆت تەرخان کردووە و سووتاویت لەم ڕێیەدا، بزانە کە عیشق لە تۆ دوور نییە!**

بۆ دۆزینەوە مەگەڕێ! بەڵام بیریشت نەچێ ئەو کەسانەی دۆزیویانەتەوە هەموویان لە گەڕیدەکان بوون...

بەدڵنیاییەوە بەر ئەو شتە دەکەوێت کە بەشی تۆیە، بەڵام بۆ ئەم مەبەستە هیچ مەرج و کۆتوبەندێک دامەنێ. مەرج و کۆتوبەند بەیەکگەیشتن دوا دەخات و دووچاری سەختی دەکات.

تۆ لە دەرگا دان بەردەوام بە، ئەو دەرگایە بەدڵنیاییەوە دەکرێتەوە. هێندە بەسە کە بزانی چۆن لە دەرگا بدەیت، نازانم کەی دەکرێتەوە، بەڵام هێندە بەسە لەبەر دەرگاکە چاوەڕوان بمێنیتەوە.

هەموو ڕۆژێک لە جێیەکی جیاوازەوە کۆچکردن چەند جوانە.

هەموو ڕۆژێک دانیشتن لە شوێنێکی تازە چەند جوانە.

چەند خۆشە بێ لێل بوون و بەستن زنەت بێ.

تەواوی ئەوەی لە دوێنێدا بوو، هەر لەگەڵ خودی دوێنێ ڕۆیشت.

ئێستا دەبێت قسەیەکی تازە بکەیت...'



"خامۆش بە چونکە خامۆشی باشترە لە هەنگوین نۆشی
لە نێو سۆزی دەربڕیندا، داینێ ئاماژە..."



# دێڕی هەژدەهەم

**تێناگات لە عاریفی پێگەیشتوو، کەسی خام**

**قسە دەبێ کورت و پوخت بێ، وەسسەلام**

مەولانا لە دێڕی هەژدەهەمدا نەینامە بە کۆتای دەگەیەنێت.

ڕەنگە بۆ ئەوەی لێی تێبگەین، بێدەنگی بە پێویست زانیوە، هەر چەندێک زیاتر قسە بکەیت، هەرچەندێک هەوڵ بدەیت زۆر ڕوونکردنەوە بدەیت و هەرچەندێک بۆ باوەڕ پێکردنی ئەوانی تر خۆت ماندوو بکەیت، بە هەمان ئەندازە کەمتر لێت تێدەگەن.

سەرەڕای ئەوە هەرچەندێک بۆ دەربڕینی مەبەستەکەت تێبکۆشیت، لە کۆتاییدا هەر کەسێک بە ئەندازەی تێگەیشتنی خۆی لێی تێدەگات.

هەوڵدان بۆ ئەوەی لێت تێبگەن بێهوودەیە.

تێنەگەیشتن پرسێک نییە کە پەیوەست بێت بە تۆوە، بەڵکوو پرسێکە پەیوەست بەو کەسەی لێت تێناگات. مەولانایش بەدرێژایی ژیانی زۆر ڕەخنەی لێ گیراوە. قسەی نابەجێیان لەبارەیەوە کردووە. بەدڵنیاییەوە بە نووسینەکانی، دەربڕینەکانی و ئەزموونەکانی پێشڕەوی بەدیهێنانی فەلسەفەیەکی بەهادار بووە. ئەفسووس کە دوای ماوەیەک بڕیاری بێدەنگبوونی دا.

خۆی بە 'خامۆش' ناو برد. واتا بێدەنگ.

لە کۆتاییدا بێدەنگی بە باشتر زانی. لە ڕاستیدا نە کەم قسەی کرد و نە زۆر... هەمیشە بە ئەندازەی پێویست قسەی کرد و کە کاتی خۆی هات، بێدەنگی هەڵبژارد.

مەولانا بەردەوام بیرمان دەخاتەوە کە 'هەرچەندێکت دەوێ بزانە، زانیارییەکانت بە ئەندازەی تێگەیشتنی کەسی بەرانبەرتن.' چونکە قسەکردن لەگەڵ نەفام بۆ کەسێکی دانا زۆر دژوارە؛ چونکە نەفام هەرچی بەسەر دەمیدا بێت، دەیڵێت...

هەر بەو جۆرەی کە هەموو شتێک کاتی تایبەتی خۆی هەیە، زانیارییەکانیشت وادەیەکی تایبەتیان بۆ تێگەیشتن هەیە.

ئەو کەسەی ئەمڕۆ تێنەگات، ڕەنگە ماوەیەکی تر تێبگات، لەوانەیشە هیچ کات بەدرێژایی ژیانی تێنەگات.

هۆشیاری هەمیشە ئاشکرایە، شاراوە و پەنهان نییە، بەڵام تێگەیشتنی بۆ هەمووان و لە هەر دەمێکدا، کاری کردە نییە. هۆشیاری لای کەسێک دروست دەبێت کە ئامادەیی هەبێت، لەگەڵ کەسێک کە ئامادە بێت، دیدار دەکات و دەبوژێتەوە.

ئەم ڕستەیەم زۆر خۆش دەوێت: "مشتومڕێکی دوورودرێژ پیشانی دەدات کە حەق لای هیچ کام لە دوو بەرەکە نییە." ساڵانێک لەمەوبەر ئەم قسەیەم بیستووە، بەڵام بیرم نەچۆتەوە.

واتا دوای ماوەیەک ئیتر بابەتەکە ئەوە نییە کە حەق لای چ کەسێکە یان نییە... تەنها دەبێت مشتومڕ و چەلەحانێکە کۆتایی بێت. دیارە کە هیچ کام لە دوو لایەنەکە ئامادەیی ئەوەیان نییە وانەی پێویست لەم ئەزموونە وەربگرن. لەم ڕووەوە دەبێت هێندێک جار بێدەنگ بیت، چونکە بێدەنگی زۆربەی کات شتانێکی زۆر دەردەبڕێت.

مەولانا بە وتنی "بایە هێواشەکانیش دەتوانن ئاوە تەنکەکان بخەنە جووڵە، بەڵام زەریاکان تەنها بە عیشقێکی قووڵ دەکەونە جووڵە. تێگەیشتم کە هەر شتێکی قووڵ و ڕازئامێز بێدەنگ دەبێت. تێگەیشتم کە هەموو شتە شکۆمەندەکان، بێدەنگ دەبن." ڕاستییەکەی ئەم چەمکەی بەتایبەتی دەربڕیوە کە هێندێک لە هۆشیاری و ئەزموونەکان بە وشە دەرنابڕدرێن. باشترین ڕێگە بۆ دەربڕینی ئەم هۆشیارییانە تەنها دەیتوانی ئاشکراکردنی دەنگی بێدەنگی بێت.

بۆ بیستنی ئەو ڕاستییانەی لە چوارچێوەی وشەدا جێیان نابێتەوە، پێویستە گوێ بۆ بێدەنگی ڕادێرین.

ئەی مرۆڤ "گوێبگرە"؛

گوێ لەو حەقیقەتە بگرە کە لە دڵی بێدەنگیدایە...

**کۆتایی**

ئازاد نییە ئەو کەسەی کە گەورەی خۆی نەبێت.

ئەپیکتەتوس[1]

بیرت نەچێ کە ژیانی شاد پەیوەستە بە شتە کەمەکانەوە.

مارکۆ ئۆریلیۆس[2]

گلادیاتۆر بڕیاری خۆی لە گۆڕەپانی جەنگدا دەدات.

سینکا

دۆزەخ شوێنێک نییە کە تیایدا ئازار دەدرێین، بەڵکوو شوێنێکە کەس پێمان نازانێت کە ئازار دەچێژین.

مەنسووری حەللاج

چارەنووسی خۆت خۆش بوێت، چونکە ڕاستییەکەی ئەوە ژیانی تۆیە.

فرێدریک نیچە

ئەگەر تۆ سووکایەتیم پێ بکەیت، من سووک نابم.

دیوژن[3]

١- فەیلەسووفی یۆنانی

٢- لە ئیمپراتۆرانی گەورەی ڕۆم.

٣- فەیلەسووف

بەهای ژیان بە درێژییەکەی نییە، بەوەیە کە باش بژین.

میشل دومونتنی[1]

بۆ ئەوەی هێندێک کەس سامانداربن، بۆچی دەبێت ئەوانی تر هەژار بن؟

فیدل کاسترۆ

زانست نیشتیمانی ئێمەیە، بەڵام نەفامی نیشتیمانێکی غەوارەیە.

ئیبن ڕوشد

پیرۆزترین فرمێسکەکانیشمان لە چاوەکانمان بێ نیازن.

جوبران خەلیل جوبران

ڕێگەی ئەو کەسانەی کە دڵیان پڕە لە باشە، هەمیشە کراوەیە.

شەمس تەورێزی

کاتێک دەست لە جەنگان هەڵبگریت، دۆڕاویت.

ئەرنستۆ چێ گیڤارا

1- فەیلەسووفی سەردەمی ڕێنیسانس.

**Hakan Mengüç**



***ڕێگەی زۆر بۆ گەیشتن بەخودا هەن***

## من عیشقم هەڵبژارد

**ئەگەر تریفەی مانگ بەر رووخسارت ناکەوێ،**
**ئەگەر خۆر بەسەر پەنجەرەکەتدا نادرەوشێتەوە،**
**رەخنە لەمانگ و خۆر مەگرە**
**پەردەی سەر چاوەکانت لادە**





کتێبخانەی گۆڵدن بووک
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
07701598762 - 07501444434
Golden book  ktebfroshe_warzer
Warzer Book  Ktebfroshe_warzer





4000